شەریف پاشای خەندان

# بیرەوەریەکانی بەرهەڵستێك

## بەربەرەکانیی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی

وەرگێڕ
زریان ڕۆژهەڵاتی

بنکەی ژین
سلێمانی ۲۰۰٦

٩٢٣,٢

خ ٢٨٨ خەندان، شەریف پاشا.

بیرەوەرییەکانی بەرهەڵستێک: بەربەرەکانیی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی / نووسینی شەریف پاشای خەندان، لە تورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی. – سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.

ل، ١٤,٥ × ٢٠,٥ سم.

١– شەریف پاشا– بیرەوەری ٢– مێژووی تورکیا ئ– ڕۆژهەڵاتی، زریان (وەرگێڕ) ب– ناونیشان

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پێڕست و پۆلێنی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٣٣

کتێب: لەبارەی کێشەی کوردەوە، سەبارەت بە دوورخستنەوەو بڵاوەپێکردنی کوردان

نووسەر: جەلادەت عالی بەدرخان

وەرگێڕ (لەتورکییەوە): زریان ڕۆژهەڵاتی

تایپ: ڕۆژنامەی "ئاسۆ"

مۆنتاج: ڕێنوار

بەرگسازی: قادر میرخان

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٠٠٠

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

ژمارەی سپاردن: ٢٢٩ی ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی

بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستانی عیراق– سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی، کۆڵانی ٣٩، خانووی ژمارە ١٠،

(بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتایی ئەردەڵان)

تەلەفۆن: ٢١٢٢١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٢٢ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سندووقی پۆست: ١٤

E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

# پێشەکی

بە دەرکەوتنی چەوسانەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، دەبینین دژایەتی لەنێوان سیاسیەتو مێژوودا دروست بووەو دەستی پێکردووە. مادام مێژوو زانستێکە دەرفەتی تێگەشتین لە ئێستاو دارشتنی ئاینده دێنێتە ئاراوە، سیاسەتمەداران لە چیوارچێوەی سیاسیەتکانیاندا و بەپێی پێویست کەوتوونەتە هەولی چاوپێداخشانەنەوەو سەرلەنوێ رێکخستنەوەی مێژوو. لەبەر ئەمەیە دەتوانین بڵێین: لە ئامانجی دژایەتیی نێوان مێژوو و سیاسەتدا، مێژوو دابەش کراوەو بۆ دوو شێوەی (مێژووی رەسمی)و (مێژووی نارەسمی)و، هەریەکەیان گوزارشتێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

مێژووی رەسمی، بە شێوەیەك رێك دەخرێ کە لەوە بدوێ چۆن چینە بالادەستەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی گەیشتوونەتە ئەم ئاستەو لە کام لایەنەوە بەرەو پێش دەچن‌و، ئامانج‌و مەبەستی شەرعیەت پێدانی سیاسەتی بەجێ‌هێنراوی هێزە دەسەلاتدارەکانی تێدا هەبێ. دەستەیەك، لەبەر هەندێك هۆی دیار، ئامانجی خێردار رێز دەکەن‌و، سیاسیەتی رۆژانە لەنێو رەوتی مێژووی ولاتەکەدا بە شێوەیەکی مەنتیقیی دیاریکراو دادەرێژرێ. بەم جۆرەش کۆمەڵگەکان رێگەخۆشکەرن بۆ ئەو هێزەی کە پشتی دەگرن یا دەبێتە هۆی شکستیان، تا مێژوەکەیان بدزێ. زانیارییەکی هەڵە لەسەر رابردوو،

دەبێ بەهۆی پەیدابوونی هەم کەموکورتی لە تێگەیشتنی ڕابردوو و داڕشتنی ئایندەداو، هەم هەڵەو خیانەتی جۆراوجۆر.

(مێژووی ناڕەسمی)یش، بە شێوەیەکی گشتی، بەرامبەر بە مێژووی ڕەسمی ڕاناوەستێ. مێژووی فەرمی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە هاتوەتە مەیدانو، بە بەرگی گەورەو فرمژمارە باڵادەستیی خۆی لەنێو کتێبخانەو دەزگا پەروەردەییەکاندا چەسپاندووە. لەبەر ئەوەش، بووە بە زانستێك ڕێنوێنیی جەماوەرێکی زۆری خەڵك دەکات. بەڵام (مێژووی ناڕەسمی)، لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە بەرەنگاری ئەو هێزە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریانە بێتەوە، زۆربەی زۆری لەتاریکاییدا ماوەتەوەو، پاشماوەکەی بە شێوەی زانستێکی پەرش‌وبڵاوو ناتەواو لە دەوروبەرێکی بچووکدا بەندکراوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش (مێژووی ناڕەسمی) بەردەوام مانەوەی خۆی وەکوو لێکۆڵینەوەی بچووك لە ڕاگەیاندنو بەشە تایبەتەکانی گفتوگۆی ڕۆشنبیراندا دیوەتەوەو، ڕوونکردنەوەی جیاواز لە لێکۆڵینەوە مێژوویی–سیاسیەکانیدا هەیەو هەڵەی زۆریشی تێدایە.

لە کۆتاییی شیکردنەوەکەدا پێویستە بگوترێ کە پەیوەندیی پارچە (بەش)و گشت لەنێوان مێژوو و سیاسەتەدا بەرقەرارە: دەتوانرێ وەك (کۆنکراوەی سیاسەتەکانی ڕۆژانە) سەیری مێژوو و، وەك (ڕووی ڕۆژانەی مێژوو)ش تەماشای سیاسەت بکرێ. کاتێك بەڕێوەبەرانی پشتی پەردە سیاسەتەکانیان بە بەرنامەو زاناییەوە بە تاریکی دەهێڵنەوە، شێوەیەکیش دەدەن بە مێژوو. ئەو شتەش کە بۆ (مێژووی ناڕەسمی) دەمێنێتەوە، تەنیا ڕوونکردنەوەی کاری ڕۆژانەی

ئەو کەسانە کە لەنێو ڕووداوەکەدا بوون‌و، ئەو بیرەوەریانەی وا دواتر دەنووسرێن‌و، ئەو زانیارییانەشە کە دیپلۆماتەکان بەپێی جیاوازیی حیساب‌و بەرژەوەندەکانیان دەری دەبڕن. لەبەر ئەمەش ئەوەی وا مێژوەکەی دژەو ئەوانەی وا گرنگی بە مێژووی ڕاستەقینە دەدەن، بەپێی ئاستی بەرپرسیەکانیان، ئەم پریشکە پەرت‌وبڵاوانە دەهێننەوە لای یەك‌و ڕابردوو ڕووناك دەکەنەوە.

بیرەوەریەکان، کە یەکێکن لە گرنگترین سەرچاوەکانی (مێژووی ناڕەسمی) لەناو هەڵویستی بەڕێوەبەرێتیداو لە ئەنجامی توانایی‌و لێبووردەیی‌و نیازی ئەو کەسانەوە کە جێگایان لەنێو ڕووداوەکاندا گرتووە، شێوە دەگرن.

سەرەڕای ئەمە، هەلومەرجی باو، هۆیە سەرەکیەکان، ئەو سەرچاوەی هێزانە کە کاریگەریی خۆیان نیشان داوەو هەستی ئەو کەسانەی وا ڕۆڵیان گێڕاوە، بەشی شاراوەی ئەو بیرەوریانە پێك دێنن‌و، لەبەر ئەوەی تا ئاستێك ڕەنگدانەوەی هەڵوێست‌و بیرو بۆچوونەکانە، گرنگییەك‌و بەهایەکی تایبەتیان لە مێژوودا هەیە“ تەنانەت بیرەوەریەکانی چەند کەسێکی نێو هەمان ڕووداو، یارمەتیدەرێکی باش دەبن بۆ ڕوونکردنەوەی مێژوو.

ئێمە، وەك دەزگای پەخش‌و بڵاوەکردنەوەی "نەهیر-چۆم"، هەست بە بەرپرسیی خۆمان دەکەین بەرامبەر بە خستنە مەیدانی مێژووی نزیکمان‌و گەیاندنی بیرەوەریەکان بە دنیای خۆمان، کە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژووی دژن‌و زانستی مێژووییمان پێش دەخەن. بەو هێزو هەوڵەی کە ئەم بەرپرسییە پێی داوین، وەك هەنگاوی یەکەم (زنجیرەی

مێژووی نزیکمان بە بیرەوەریەکانەوە) دەست پێکردووە. لەگەڵ ئەوەی کە لایەنی کەسایەتی ئەم بیرەوەریانە لەبەرچاو دەگرین، دەمانەوێ بە شێوەیەکی ئاشکرا سەرنجتان ڕابکێشین بۆ لایەنە کۆمەڵایەتیەکەی. ئێمە ئەم کارە بە شیاوی پێشکەشکردن دەزانین.

دەزگای چاپ و پەخشی چۆم (نەمیر)

# نارەزاییەکانی شەریف پاشا

شـەریف پاشـا یەکێکـە لـە شەخـسیەتە ڕەنگـینو لێوەشـاوەکانی قۆنـاغی دەسـتووریی دووهـەم* ، سـاڵی ١٨٦٥ لـە ئەسـتەنبووڵ لـەدایك بـوو. بـاوکی، کـوڕی سـەعید پاشـای کـوردێکی سـولەیمانیەیی بـوو، بەرپرســـیی جۆراوجـــۆری وەك چـــاودێریی کاروبـــاری دەرەوەو سەرۆکایەتیی شواری دەوڵەتی وەرگرتووە.

شـەریف پاشا لـە قوتابخانـەی سـوڵتانی (مەکتـەبی سوڵتانییە) لـە ئەســتەنبووڵ خوێنــدنی تــەواوکردو، لــە فەڕەنــساش ئاکادیمیــای عەسکەریی (Saint cyr)ی تـەواو کـرد. بـە شـێوەیەکی عەسـکەری لـە فەڕەنساو بڕۆکسیل ماوەتەوە.

دواتـر سـاڵی (١٨٩٣) لـە باڵیۆزخانـەی ستۆکهۆڵم ئـەرکی وەرگـرت. هـەر دوای ئـەوەش، بـوو بـە ئەنـدامی (کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تـەرەقی)و لـەدژی بەڕێوەبەرایەتیەکـەی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووهـەم کەوتـە کارو چالاکی.

ئـەنجامی کـارو چـالاکیەکانی (کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تـەرەقی)، بـوو بـــەهۆی ڕاگەیانـــدنی قۆنـــاغی دەســـتووریی دووهـــەمو ســـەپاندنی تەواوەتی دەسەلاتی ڕێکخستن بەسـەر بەڕێوەبەرایەتیـدا. بەلاّم شـەریف

---

* مەشرووتەی دووهەم.

پاشا دوای ماوەیەکی کورت لە (کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی) جودا بووەوەو کەوتە ڕیزی نەیارانەوە. ناوبراو هۆی دەست لەکار کێشانەوەکەی خۆی لە داوانامەکەیدا بەم شێوەیە دێنێتە سەر زمان: ((کۆمەڵە بە لاڕێدا چووەو بەرەو دۆڵو قووڵاییەکی مەترسیدار دەچێ)). هەروەها دەڵێ: نامەوێ خۆم بخەمە بەر ئەو بەرپرسییەی کە لە ئەنجامی یاریکردنەوە بە چارەنووسی خەڵك دێتە ئاراوەو، دەمەوێ خۆمی لێ بپارێزم.

بەگوێرەی ئەو شتانەی کە دواتر نووسیویانە، دوای قۆناغی ئەزموونێکی کورتو کاریگەر، دژایەتی لەنێوان ئەوانو سەرکردە ئیتیحادیەکاندا دروست بوو. ئەم دژایەتیە تەنیا شتێکی زانستیو سیاسی نییە، بەڵکوو دژایەتیەکی ڕەوشتیشە. ئیتیحادیەکان ئەو کەسانەیان دەکوشت کە بەگوێرەی ویستو داخوازیەکانی ئەوان نەدەجووڵانەوەو حەزیان لەوانە نەدەکرد. بەم جۆرە کەوتبوونە ناو داوی هەڵویستێکی خراپی دوور لە بەها ڕەوشتیەکان. هەر لەگەڵ بەدەستەوەگرتنی بەڕێوەبەرایەتیدا، لەجیاتی ئەوەی خۆیان بە کێشەکانی وڵاتەوە خەریك بکەن، یەکسەرو بە شێوەیەکی ناڕەوا دەستیان کرد بە پڕکردنی کاسەو گیرفانەکانی خۆیان.

شەریف پاشا بەرامبەر بەم جۆرە هەڵوێستانەی ناو ڕێکخستن ڕاوەستاوەو، لە جێ و ڕێی جۆراوجۆردا ڕەخنەی لێ گرتووە. بەڵام ڕەخنەکان لەوە زیاتر کە سەرکردە ئیتیحادیەکانیان کردووە بە دوژمنی خۆی، کەڵکی هیچ شتێکی تریان نەبوە. جیابوونەوە لە کۆمەڵە، ڕێگەچارە نەبوو بۆ شەریف پاشا، بەڵکوو پێویست بوو وەك پیاوێکی

بەرپرسی دەوڵەت، ئەو ناهەقیو ستەمانە کە بینیونی، بدرکێنێ. بەڵام کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ئەو سینگ فروانییەی نەبوو کە ڕێ بە ڕەخنەگرتنو ئۆپۆزیسیۆن بدات. هەر لەبەر ئەمەش شەریف پاشا چووە دەرەوەی وڵاتو، لەوێ درێژە بە بەرهەڵستیو دژایەتیەکەی خۆی دا.

جیابوونەوەی شەریف پاشاو چوونە ڕیزی نەیارانەوە، لەلایەن (ئیتیحادو تەرەقی)یەوە وەك ڕووداوێکی ئاسایی چاوی لێ نەدەکرا. ئەمە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە هەڵوێستی ئیتیحادیەکاندا بەرامبەر بە شەریف پاشا دیاردەبێ.

لایەنگرانی کۆمەڵە لەپێشدا، دەستیان بە بڵاوکردنەوەی قسەو باسی جۆراوجۆر کرد لەسەر شەریف پاشا، تا دەست بەستراوی بکەنو هیچ کاریگەرییەکی نەهێڵن. شەریف پاشا، بەگوێرەی قسەی ئەمانە، داوای پۆستی باڵیوزی گەورەی لەندەنی کردووە بۆ خۆی. بەڵام کاتێك ئەو ئەرکەی پێ نەسپێردراوە، یەکسەر دەستی بە دژایەتیکردن کردووە. ڕووی ئەم باسوخواسانە لەسەر ئەوەیە کە وەهای نیشان بدات شەریف پاشا کەسێکی بەرژەوەندپەرستو پلەوپایەخوازو بێشەخسیەتە.

جگە لەوە، ئیتیحادیەکان هەر بەمەوە نەوەستانو هەڵوێستەکانی خۆیان توندتر کردەوە" لەلایەکەوە بە ئامادەکردنی نامیلکەو نووسراوی هەمەجۆر هەوڵی تێکدانو ڕووخاندنی کەسایەتیی شەریف پاشایان داو، لەلایەکی تریشەوە بە دەرکردنی بڕیاری پاشملەی ئیعدامی شەریف پاشا، ویستیان لەبەردەم ڕای گشتیدا وەك تاوانبارێك لەقەڵەمی بدەن. تەنانەت ئەم هەڵوێستەیان بەرامبەر بەو کەسانەش

نیشان دا کە گومانی ئەوەیان لیٚ دەکردن وا پەیوەندییان بەوەوە هەیە. هەوڵی پاکسازیو قووتدانو لەناوبردنی نەیارانی خۆیان دەدا بە ڕێگەی گرتن بە ئیددیعای سەرپێییو موحاکەمەو زیندانیکردنو دوورخستنەوەی ئەو کەسانەی وا هاوڕیٚو لایەنگری بوون.

کتێبە بچکۆلانەکەی (بەرامبەر بە هیچوپووچ) کە مەزندە دەکریٚ ساڵی ۱۹۱۰ بە "سولەیمان نەزیف"یان نووسیبیٚ، نموونەیەکی سەیری هەڵمەتی پڕوپاگاندەی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقییە بۆ سەر نەیارانیان.

ناوەڕۆکی کتێبی (بەرامبەر بە هیچوپووچ)، کە لە شێوەی (ئەم نامیلکەیە باسی وەزعو حاڵی باووباپیری شەریف پاشای ڕۆژنامەنووسو باڵوێزی پێشووی ستۆکهۆڵم دەکات)دا پێشکەش کراوە، لەڕووی نیشاندانی ئاستی ئەو پڕوپاگاندەیەوە کە لەدژی شەریف پاشا بەڕێوەبراوە، گرنگییەکی تایبەتی هەیە. ئەم کتێبە بچکۆلانەیە، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی، پڕە لە سووکایەتیو تاونبارکردنی لەم چەشنە: ((ئەم تاونبارە ناسنامەیەکی هەیە کە باسی باوکێکی سولەیمانیەیی بەناوی سەعید پاشاوە تێدا دەکات، بەڵام لەڕاستیدا دیار نییە لەکوێوە هاتووەو، تەنانەت لەوە دەچیٚ باوکو دایکی ڕاستەقینەشی دیار نەبن)). ((ئەم خیانەتکارە کە بە ناوی وڵاتپارێزییەوە خۆی شاردبووەوە، یەکێکە لە خاشاکە پیسو کۆبووەوەکانی دەورانی پێشوو))، ((لە شۆڕشی یەکەمدا کەسێکی دووڕوو بووە، بەڵام لە شۆڕشی دووهەمدا ڕووی ڕاستی ئاشکرا بووە)).

سەرەڕای ئەو هەموو کاری پڕوپاگاندەیەی کە دژ بە شەریف پاشا بەڕێوە برا، کۆمەڵە بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی پاشملە لە دادگای

(دیـوانی شـەڕ)دا بڕیـاری لەسـێدارەدانی بـۆ شـەریف پاشـا دەرکـرد. هەنــدێك لــە هاوڕێکــانیو نەیارانیــشیان بــە تــاوانی (دەســتەی خیانەتکاران) زیندانی کردو دوورخستەوە.

هـەروەها لـە پـاریس هـەوڵێکی تیرۆرکردنـی شـەریف پاشـایان دا، بـەڵام سەرکەوتوو نەبوو. شەریف پاشا، بۆ ئەوەی بتوانێ دژایـەتی خۆی بکاتـە شتێکی ڕێکخراو، پارتێکی بەناوی (پارتی ڕیفۆرمی بنچینەییی عوسمـانی) (Le parti Radikal Ohoman)یـەوە دامەزرانـد. مانگنامەیـەکی تـورکی- فەرەنسیشی بەناوی "مەشرووتییەت"ـەوە دەرکرد.

بە شێوەیەکی گشتی، هـەوڵی دروستکردنی بەرەیـەكو هاوکاریی لەگـەڵ هــەموو کەســایەتیو ڕێکخـراوە نەیارەکانــدا دا، بـە کۆشــشو سەردانەکانی خۆی لەلای حکوومەتی فەرەنسا، دەیویست کارێك بکـات حکوومـەتی فەرەنـسا هاوکـارو پـشتیوانی بەڕێوەبـەرێتیی ئیتیحـادو تەرەقی نەبێ. بەڵام ئەم هـەوڵو تەقەلایـەی لـە ئەنجامـدا وەك هەوڵـدانێك بـۆ دروسـترکردنی دووبـەرەکی لـەنێوان حکوومـەتی پـاریسو دەوڵـەتی عوسمانیدا لەقەڵەم درا.

دوای ماوەیـەکی زیـاتر لـە چـوار ساڵو لـە سـاڵی ١٩١٢دا، هاتـەوە ئەسـتەنبووڵو چـاوی بـە پادشـا کـەوتو، لـەوێ بـە بەڵگـەوە بڕیـاری پووچـەڵبوونەوەی حـوکمی ئیعـدامی لەسـەر خـۆی دەرکـرد. بـەڵام لـە بەسەرداداندنە بەناوبانگەکەی (بابی عالی)دا، ئیتیحادیـەکان سـاڵی ١٩١٣ حکوومەتیان بەدەست هێنایـەوە. بۆیـە دووبارە بەناچاری گەڕایـەوە بـۆ پاریس. دوای تیرۆرکردنو کوژرانی مەحموود شـەوکەت پاشا کـە ببـوو بە سەرۆك وەزیرانـی ئەوکاتـە (سـەدری ئەعزەم)، ئیتیحادیـەکان دیـسان

لە هەمان دادگای (دیوانی جەنگ)داو بەبەهانەی ئەوەوە کە شەریف پاشا دەستی لەم کارەدا هەبوە، بڕیاری ئیعدامیان لەسەر دەرکردەوە. لەگەڵ ئەندامە ڕاکردوەکانی باڵی (حوڕپیەتو ئیئتیلاف)دا کەوتە هاوکاریو، بوو بەهۆی یەکگرتنەوەی ئەم باڵە لەگەڵ (پارتی ڕیفۆرمی بنچینەییی عوسمانی- اصلاحات اساسیەء عپمانیە فرقەسی)داو، لە ئەنجامی ئەمەدا ڕێکخراوێکی تریان بەناوی (دەستەی حوڕپیەتو ئیئتیلاف)ەوە دامەزراندو، خۆیشی سەرۆکایەتیەکەی وەرگرت.

شەریف پاشا هەموو بیرو بۆچوونو ئایدیالەکانی خۆی لە نووسراوەکانی ناو "مەشرووتییەت"دا هێنایە سەر زمان. ئەگەر بەگوێرەی نووسراوەکانی "تانەر تیموور" کە لە نووسینەکانی ناو "مەشرووتییەت"ی شەریف پاشای کۆڵیوەتەوە (دوژمنێکی ئیتیحادچیەکان / شەریف پاشاو ڕۆژنامەی مەشرووتییەت، کۆمەڵگاو مێژوو، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ٧٢، لاپەڕەی ١٧-٢٠) سەیری شەریف پاشا بکرێ، دەردەکەوێ شەریف پاشا یەکێك بووە لەو کەسانەی وا بەرامبەر بە ئامانجەکانی ١٩٠٨ دروست ماوەتەوە. بەگوێرەی بۆچوونی ناوبراو ((نیشانەو سمبولی دۆزەکەیو شێوەی شیکردنەوەی بۆ دەسەلاتی ئیتیحادی، شتێکی سەیرو زۆر جیاوازترن لەو تێزانەی کە تا ڕۆژی ئەمڕۆ ماونەتەوەو، تەنانەت بالادەستنو بەردەوامیشن)). شەریف پاشا لە نووسینەکانی خۆیداو کاتی ڕەخنەگرتنی لە ئیتیحادو تەرەقی، زیاتر هەڵوێستەی لەسەر سیاسیەتی شۆڤینیانەو جیاوازی دروستکردن دەکرد، ئەوەیش چ چۆن ویستوویانە گوشاری ئۆپۆزیسیۆنی بەرهەمی ئەم سیاسەتانە بە

ئەشکەنجەو تاوانکاری لەناوبەرنو، نموونەی جۆراجۆر دێنێتەوە.
بۆچوونەکانی شەریف پاشا تایبەتن بە، هەم سیستمێکی سیاسیی دەستووری وا کە گرووپە ئیتنیو دینیەکان بە هاوبەشی بەشداریی تێدا بکەنو، هەم سیستمێکی ئابووریی لیبراڵیش کە گەشەپێدانی وڵات بپارێزێ. وەکوو هەموو سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆی، دوور بووە لە ویستی سەربەخۆیی. هەروەها بەرامبەر بە پەیوەندیی دیپلۆماسیی ئیتیحادیەکان کە زۆرتر دەیانویست ڕوو بە ئەڵمانیا بن، لایەنگری پەیوەندیی دیپلوماسیی ئینگلتەرە–فەڕەنسا بوو.
لە بەشی کۆتایی کتێبەکەو بەشی سەبارەت بە بەرنامەکانی پارتەکەیدا، بۆچوونەکانی شەریف پاشا لەسەر ئەم بابەتانە بە شێوەیەکی کورت دەبینرێن.

دوایین چالاکییەکی سیاسی کە شەریف پاشا ویستوویەتی ئەنجامی بدات، هەوڵدان بووە لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی. شەریف پاشا وەك نوێنەریَ کورد بەشداریی کۆنفرانسی ئاشتیی پاریسی کردو بەهۆی (چەند یادداشتێك سەبارەت بە داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورد) (Memorandum sur les Revendicatios du peuple Kurde)ەوە، گەلی کوردی پاراستو داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی کرد لە چوارچێوەی پرەنسیپەکانی "ویلسۆن"دا و، پەیمانێکی لەگەڵ "بۆگۆس نوبار پاشا"ی نوێنەری ئەرمەنیەکاندا لەم بارەیەوە مۆرکرد (١٩٢٠). شەریف پاشا، فەلسەفەی سیاسیی خۆی، لەسەر ڕەخنەگرتن لە شۆڤێنیزم داڕشتووە. شایانی باسە، ئەگەر چاوێك بە ژیانی

سیاسیی ڕابردووی شەریف پاشادا بخشێنرێ، دەبینرێ هیچ باسی مافەکانی گەلی کوردی نەکردووە. ئەم مەسەلەیە، دەشێ بە شتێکی سەرسوڕهێن دابنرێ. جێی وتنە، زۆربەی مونەووەران و ڕۆشنبیرانی عوسمانی، سەرباری ئەوەی کە لە هەموو تەمەنی خۆیاندا ویستوویانە یەکێتی و یەکگرتوویی عوسمانی بپارێزن، بەلام دواتر کە تێگەیشتوون ئەم پارچەپارچەبوونە هەر دروست دەبێ، ئەمجا کەوتوونەتە خۆیان و ویستوویانە گەلەکەیان لەوبارەیەوە ئاگادار بکەنەوە و پارێزگاریی مافەکانی بکەن.

لە سالانی ١٩١٠ بەدواوە کە دەولەتە گەورەکانی ڕۆژئاوا بەرنامەیان بۆ دابەشکردن و هەلوەشاندنەوەی دەولەتی عوسمانی دەخستە ڕوو و دەیانویست ئەم دەولەتە داگیر بکەن، شتێکی ئاسایییە کە شەریف پاشاش لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم بەرنامانەدا لە مافەکانی گەلەکەی دووابێ و سەربەخۆیی هێنابێتە ڕۆژەڤەوە. ئەمە شتێك نییە کە کەس لێی تێنەگات. ئەم هەلوێستەش پەیوەندیی بە شۆڤێنیزم و ئەوشتەوە نییە کە "تانەر تیموور" بە گەڕان بەدوای (دۆزو هەلچوون)ێکی تازە ناوی دەبات (تەماشای بەشی گومان و دوودلییەکان سەبارەت بە داهاتووی ئەم کتێبەی بەردەستتان بکەن).

شەریف پاشا سالە ڕەنگینەکانی ژیانی خۆی لە پاریس بەسەربردو، سالی ١٩٢٣ دا ڕۆیشتە قاهیرەو، تا مردن لەوێ مایەوە. زانیاریمان لەسەر ئەم بەشەی دواییی ژیانی شەریف پاشا نییە، لە دەرەوەی ئەم کتێبە بەردەستتان. (Memorandum sur les Revendications du Peuple Kurde)و یەکێکی تریشی بەناوی (Quelgues Reflexions surla Gure1913) وە هەیە.

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتمان کـە سـەردێڕە تایبەتـەکانی تێکۆشـانی نیـشتمانی، دژایـەتیکردنی ئیتیحـادو تـەرەقی، بـەرەو مەشـرووتییەت (دەستوور)-من و ژیانم دەگرێتەوە، گێڕانەوەی ئەو خەباتە بێئامانەیـە کـە بەرامبـەر بـە ئیتیحـادو تـەرەقی کردوویـە. لەگـەڵ ئەمەشـدا، بـیرو بۆچـوون و ئایدیالـەکانی شـەریف پاشـا، بەڵگەیـەکی گرنگـی قۆنـاغی مەشـرووتییەتە کـە ڕووداوو کەسـایەتیە گرنگـەکانی ئـەو سـەردەمە دەنرخێنێ. هەر لەبەر ئەمـەو سـەرەڕای ئەوەی کە بابـەتی وای تێدایـە دەبـێ بـەهۆی ئـەوەی وا دووبـارە زۆر بابـەتی تـری ئـەو سـەردەمە بخەینـەوە بـەر باس و نرخانـدن، بـەڵام لـەم بارەیـەوە بایـەخی زیـاتری هەیە.

ا: ئۆزالپ

# پێشەکی

بەرلەوەی بچمە سەر بابەتە سەرەکیەکە، هەست بە پێویستی ئەوە دەکەم کە دەمەتەقێیەك لەگەڵ خوێنەرانمدا بکەمو لەو ڕێیەشەوە باسی بیرو بۆچوونەکانی خۆم بکەم.

نازانم لەبەر چ هۆیەکە وا (مەشرووتییەت)[1] و دوژمنانی ئازادیەکانمان بە هیچ جۆرێك حەزی دەرکەوتنو ئاشکرابوونی خودایی‌ی ئەو ئارەزوە پیرۆز و ئامانجە بەرزانەیان لەدڵدا پەروەردە نەکردووە کە ئەمڕۆ پاڵی بە ئێمەوە ناوە بەرەو ئەم دوورخراوەییە

---

[1] مەشرووتیەت، قۆناغی بەڕێوەبەرایەتیو دەسەڵاتی دەستووریو پارلەمانی‌ی کاتی عوسمانیەکانە. ئەم قۆناغە لە کارەکەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمەوە، کە دەستووری بنچینەیی‌ی ڕەت کردەوەو پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە، دابڕانێکی تێدەکەوێو، دەبێ بە دوو بەشەوە: مەشرووتییەتی یەکەم لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٩ وە کە دەستووری بنچینەیی پەسندکرا تاوەکوو ١٣ی شوباتی ١٨٧٨ بەردەوام بوو. مەشرووتییەتی دووهەمیش کە وەك (دەورەی ئازادی) ناوزەد دەکرێ، لە ٢٣ی تەموزی ١٩٠٨ ـەوە کە دووبارە دەستووری بنچینەیی کەوتەوە مەیدانی جێبەجێکردن تا ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بەردەوام بوو. لەم قۆناغەدا کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەڕێوەبەرێتی‌ی سوڵتان عەبدولحەمیدی لەلای خەڵکی شیرینتر کردو لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەمو کۆتایی‌ی ئەم قۆناغەدا ئیمپراتۆریای عوسمانی دابەش کرا.

ئارەزوومەندانەیە. بەهەر حاڵ ئەو شتانەی کە ئەوان تاکوو ئێستا بەرامبەر بە بیروڕاو بۆچوونەکانی ئێمە کردوویانە، لەڕێگەی ئەم شەڕەماندا نەبوە، بەڵکوو هەمووی بەرامبەر بە خۆمان و کەسایەتیمان بووە. خاڵی دەستپێکردنی ئێمە دەستوور بوو، کەچی ئامانجی سەرەکیی هێرشەکانی ئەوان، کەسایەتیی ئێمە بوو. ئێمە خوازیاری ئازادی بووین، بەڵام ئەوان بە خۆپەرستییەکی چەپەڵ و بێسوودەوە وەڵامیان داینەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە زۆرجار، لە خەبات و کارو چالاکیە ئازادیخوازانەکەماندا، تووشی ستەم و تەنگانەو ئازار بووین، کەچی هەمووکاتێك بە مەبەستی پێشێلکردنی ئامانجە ئازیزەکانمان و ویست و نیازی نیشتمانپەروەری و بەتایبەت مەشرووتییەتی عوسمانی، کەسایەتیی ئێمەیان کردە نیشانەو، چەقاوەسوویی و سووکایەتی و هێرشیان بەرامبەر کردین. لایەنی ناسۆرو سەیری ئەوانەی وا دەسەڵاتیان سەراوژێر کردو، کوێرایی و نەزانی و دوژمنایەتیی بیروڕاو بێزهاتنەوەیان لە ڕەوشت و مەردایەتیدا لەگەڵ خۆدا هێنایە ئاراوە. ئەوەبوو لەژێر دەمامکی (مەشرووتییەتێك)دا خۆیان خستە مەیدانەوە. ئەم هەوڵدان و کۆششە نەزانانەی کە هیچ کاتێك شتێکی شەرەفمەندانە نەبوە، زۆری نەخایاند. ئەمڕۆ تا ئاستێك، بە هەموو ناسنامە ڕیسواو نەدارەکەیانەوە، دەرکەوتوون و ئاشکرا بوون..

ئەوانەی بە دۆست و دوژمنەوە وا هێرشیان کردە سەر ئێمە، ئەمڕۆ شەرمەزار بوون، چونکە ئێمە هەر لەسەرەتاوە دەمانگوت ((زۆری پێناچێ هەق و ڕاستی دەکەونە مەیدانەوە)). لەڕاستیشدا وەهای لێ

هـات. کـات بـه دەرچـوونێکی پـڕ لـه تووڕەییـەوە ئـەو دەمـامکی دووڕوویـیـەی داکێـشاو دڕانـدنیو پارچەپارچـەی کـرد. دڵنیـام بـە بـاوەڕێکی پتـەوەوە کـە دانەبەزێتـەوە، دۆزی نەتـەوەییمان دوای ماوەیەکی تر بە هەموو لایەنێکیەوە دەکەوێتە سەر (شانۆ)ی عەدالەت.

لەڕێگەی ئازادیخوازیدا، بەرامبەر بەو خیانەتە پیسو خیانەتکارە گەمژەو تاوانبارکرانە ناڕەوایانەی کە دەهەق بە ئێمە کراون، چی دەبێ با ببێ، باوەڕمان بە چاوپۆشیکردن لە مافی خۆپاراستن نییە، هەر بۆیە وەڵامیان دەدەینەوە.

لەڕاستیدا ئەم کتێبە بچووکە، کورتە مێژوویەکی بەسەرهاتەکانی تەمەنێکە کە لەڕێگەی نەتەوەو مەشرووتییەتدا تووشی دەیان ئاژاوەو خەفەتو مەینەت بووە. چەندین ڕووداوی خەفەتاویو ویژدانبڕمان بەسەردا هات، لەپێناوی ئەم دۆزە خۆشەویستەماندا، چەندین شتمان لە دۆستو دوژمن بینیو، دەیان دەقیقەمان بە بەدبەختی بەسەربرد.

هەموو ئەم کێشانە، لەگەڵ ناوەڕۆکو ڕاستیەکانیدا، بەشێوەیەکی ڕاستو دروست خرایە پێش چاوان. هیواو مەبەستی سەرەکیمان ئەوەیە، وەکوو هەلەکانی تریش، لەم ڕێگەیەوە تا ئەو جێگایەی کە بتوانین بە پشت بەستن بە ئەزموونەکانمان، باسی بیرو بۆچوونی ئازادیخوازەکانی عوسمانیو بنەماکانی مەشرووتییەت بۆ هاووڵاتیەکانمان بکەین. هەروەها دەمانەوێ لەسایەی ئەمەوە، لەگەڵ پاراستنی مافەکانمدا، خزمەتێکی مەشرووتەپەروەرانە بە گەلی عوسمانی بکەینو ڕێگەیەکیان پێشان بدەین. ئەمەش بەختیارییەکی بەهادار و گرنگە، هەر بەوپێوانەیەش تووڕەییو گرژی دروست دەکات.

هەموو بەسەرهاتە پڕ لەئازارەکانم وەکوو خۆی باس کرد. دیاریکردنی عەدالـەت و سـەقامگیرکردنی مافیـشم بـۆ گەلـە بـەڕێزەکانی عوسمـانی هێـشتەوە، کـە هـەمووکاتێك ویـستوومە سروشـتە بـەرزو پاکەکـەی تەسـلیمی ئـەوان بکـەم. ئیـدی لەمەوبـەدوا دوژمنانمـان چـی لـەبارەی ئێمەوە دەڵێن با بڵێن، هەموو بڕیارێکی ئەو دادگا نەتەوەییە بەڕاستی وەردەگـرم و پەسـندی دەکـەم. خـۆی لەبنەڕەتـدا هـۆی ئـەوەی کـە ڕای گـشتی لەگـەڵ ئێمەدایـە، دەچـێتەوە بـۆ زیـاتر بەسـترانەوەی ئـەوان بـە ڕاستی و هەقەوە. ئەمە هەر لەئێستاوە وای لـە ئێمـە کردووە ئەم نامـەی پارێزگارییە بنووسین کە ئەمڕۆ ئارەزووی بەرزبوونـەوەو پێشکەوتنیان لە عوسمانییەتدا هەیە.

ئیـدی سـەرەڕای لافوگـەزافی سـتەمخوازەکان، ویـژدانێکی گـەورەو ڕەسـەن لـەم چوارچـێوەیەدا دەژی. کـەوابوو ((مـافی ڕۆشـنگەری هـی قوتابخانەیـە)) و ((مـافی ڕوونکردنـەوەی ڕاسـتیەکانیش هـی کەسـانی عاقڵ و ژیرە)).

۱۹۱۱: پاریس-شەریف

١٠ی ئاب[٢] ڕۆژێکی گەورە بوو، بە هەموو بەرەکەتی خۆیەوە

---

[٢] ڕێکخراوی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ٣ی حوزەیرانی ١٨٨٩ لە مەکتەبی پزیشکیی عەسکەری لەلایەن ئیسحاق سکووتیو ئیبراهیم تەمۆو عەبدوڵڵا جەودەتو محەمەد ڕەشیدو حیکمەت ئەمینی قۆنیەییەوە دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە، سەرەتا ناوی کۆمەڵەی "ئیتیحادی-عوسمانی"ی لەخۆ نابوو، دواتریش لەپاش ڕاپەڕینەکەی ١٩٠٨ ـەوە تا کۆتاییی مەشرووتییەتی دووهەم، لەگەڵ هەندێک پچڕانی ناوبەناودا، دەسەڵاتو بەڕێوەبەرێتیی دەوڵەتی عوسمانیی لەدەستدا بوو. ئامانجی سەرەکیی ئەم ڕێکخستنە بەرەنگاربوونەوەی بەڕێوەبەرێتیی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم بوو. ئەم ڕێکخراوە، ساڵی ١٨٩٤ پەیوەندیی بە ئەحمەد ڕەزاوە کرد لە پاریس. ساڵی ١٨٩٥ ناوی خۆی گۆڕیو بوو بە "کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقیی عوسمانی". لەوەبەدواش، زۆربەی کارو چالاکیەکانی خۆی لە دەرەوەی وڵات بەڕێوە دەبرد" لە پاریس گۆڤاری "مەشوەرەت" ناوو لە میسریش گۆڤارێکی بەناوی "میزان"ـەوە دەردەکردو، هەر لەدژی دەوڵەت ژمارەیەکی زۆر نامیلکەی جیاوازی بڵاوکردەوە. دواتر "موارد میزانجی" بوو بە سەرۆکی ڕێکخستن.

ئەم ڕێکخراوە دووجار هەوڵی کودەتای دا لە ئەستەنبووڵ. بەڵام هەردوکیان ناسەرکەوتووانە کۆتاییان پێ هات. دوای ماوەیەک، موردا میزانجی وازی لە سەرۆکایەتیی ئەم ڕێکخراوە هێناو ئەحمەد ڕەزا جێگای گرتەوە. بە هاتنی د. بەهادین شاکیرو د. نازم بۆ پاریس، ئەم ڕێکخراوە لە باری کارو چالاکییەوە زیندووترو بەهێزتر بوو. شایانی باسە، ئەم ڕێکخستنە لەم کاتانەدا زیاتر قورساییی دەخستە سەر بەشی ڕاگەیاندنو پروپاگەندە.

ساڵی ١٩٠٧ لەگەڵ ڕێکخراوی "کۆمەڵەی ئازادیی عوسمانی"دا کە ساڵێک بەر لەوە لە (سەلانیک) لەلایەن کۆمەڵێک ئەفسەرەوە دامەزرابوو، بوو بەیەک. لەمەودوا ئیدی ڕێکخستن دەیتوانی کاروچالاکییەکانی خۆی لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتدا بە ئاسانی ئەنجام بدا، بەتایبەتی لە (ڕۆمەلی)و، هەتا لە گوندەکانیش بڵاوبووەوە. چالاکیو کاری تیرۆر لە (سەلانیک)و (مەکدۆنیە) دەست پێکران. ئەنوەر بەگو نیازی بەگ، هەندێک دەستەو تیمی تایبەتیان بەناوی (تابووری نەتەوەیی)یەوە دروست کردو

لەنێوچیاکاندا جێگیر بوون. لەم بەینەدا دەوڵەت "شەمسی پاشا"ی بۆ سەرکوتکردنی ئەمانە ڕەوانەکرد، بەڵام لە (ماناستر) کوژراو "عوسمان پاشا"ش ڕفێدراو برایە نێوچیا.

چالاکیی ناردنی تەلگراف بۆ دەربار بە مەبەستی جێبەجێکردنی دەستوورو بانگهێشتکردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك بۆ کۆبوونەوە، لە هەموولایەکەوە دەست پێکرا. ڕۆژی ۲۳ی تەمووز ئازادی لە ماناستر ڕاگەیاندرا. دوای ئەم ڕووداو و پێشکەوتنانە، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم بە ناچاری داخوازییەکانی کۆمەڵەی قەبووڵ کرد. بە ڕاگەیاندنی دووبارەی مەشرووتییەت لە ۲٤ی تەمووزی ۱۹۰۸دا، پێشوازییەکی زۆر لەنێو خەڵکدا لە کۆمەڵە کرا. ئەمە وای لێ هاتبوو کە ئیدی بە شێوەی (ڕێکخراوی پیرۆز) باسی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەکرا. ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە دەسەڵاتی ڕێکخستن لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتی و حکوومەت زیاتر بێ. دواتر ساڵی ۱۹۰۸ وەکوو پارتێك بەشداریی لە هەڵبژاردنەکاندا کردو، بە جیاوازییەکی زۆرەوە (لە باری ڕێژەی دەنگەکانەوە) سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لەگەڵ ئەمەشدا ڕێکخستن دیسان وەکوو جاران بە شێوەی کۆمەڵەیەکی شاراوە درێژەی بە کاروباری خۆی دەداو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیو بەڕێوەبەرایەتی لە کۆبوونەوەی شاراوەدا خۆیان هەڵدەبژاردو، ئەمانەی بۆ ڕای گشتی ئاشکرا نەدەکرد. کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەرامبەر بە کابینەکەی "کامیل پاشا" دەنگی بێ‌متمانەیی داو، بەو جۆرە حکوومەتی لەسەر کار لابرد. دوای ڕووداوی ۳۱ی مارت، سوڵتان عەبدولحەمیدی لەسەر کار لابردو، هەموو لایەنێکی ئۆپۆزیسیۆنی سەرکوت کرد. هەرچەندە جاروبار کابینەی دژی کۆمەڵە دەهاتنە سەرکار، بەڵام کۆمەڵە ئەمانەی بە تەنگ پێ‌هەڵچنینەکانی خۆی ناکاریگەر دەکردو دەیخستنە ژێر تین‌وتاوی خۆی. دوای ساڵی ۱۹۱۳، بەڕێوەبەرێتیی ڕێکخستن کەوتە دەستی ئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشاو جەمال پاشا.

دوای ئەو شکستانەی کە ڕێکخستن لە یەکەم شەڕی جیهانیدا ڕووبەڕووی بووەوە، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بە بەستنی کۆنگرەیەکی نائاسایی بڕیاری

دەرکەوت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دەرکەوتنە پڕ لە دڵخۆشیانەی ئەوکاتە، پێویستە بگوترێ ئەو ڕۆژە کاریگەرییەکی سیحراویی لەسەر ژیانی نەتەوەییمان داناوە. ئیدارەی پێشوو و، لەسەرووی هەموویەوە سولتانە زۆردارەکەی، کە ئەنجامێکی خراپی بێحکوومەتی و بێئیرادەییەکی ڕووخێنەرو قەیراناوییەو سەدان ساڵە بەردەوامە، ساڵانێکی درێژی دەورانێکی گڵاوی کۆیلایەتی و دەرنەبردنی پڕ لە کینەو نەفرەتو ئازاری بەسەر خەڵکی عوسمانیدا سەپاند. لەکاتێکدا هیچ چاوەڕوان نەدەکرا، سەرهەڵدانێکی عەسکەری لە (ڕۆمەلی) ڕووی داو، بەسایەی سەری ئەوەوەو لەبەر ئەوەی کە داوای وەرگێرانی ماف ئاسایی گەل یا دانانی یاسای بنچینەیی[٤] کرا، ئەو مافە درا بە

---

هەڵوەشاندنەوەی خۆی داو، لە ڕێگەی ڕێکخستنێکەوە بە ناوی "گرووپی تەجەدود"ەوە هەوڵی درێژەپێدانی چالاکیەکانی خۆی دا لەناو وڵاتدا. دوای ئاگربەست، بە شێوەیەکی گشتی هەموو بەرپرسانی کۆمەڵە ڕایانکردە دەرەوەی وڵات. زۆربەی کادێرەکانی (ئاستی خوارووتر – کادێری هەرێمی)ی کۆمەڵەش بەشداریی تێکۆشانی نەتەوەییان کرد. هەرچەندە ئیتیحادچییەکان، دوای ڕزگاری، کەڵکەڵەی وەرگرتنەوەی دەسەڵاتیان خستبوە سەری خۆیان، بەڵام ڕووداوی تیرۆری ١٩٢٦ لە ئەزمیر، بوو بە مایەی کۆتایی و ئەنجامی ئەم ڕێکخستنەو زۆربەی ئیتیحادچییەکان یا بە ئیعدام یان زیندانیکردن (بۆ ماوەیەکی درێژ) تاوانبار کران.

[٤] دەستووری بنچینەیی، ئەو یاسا بنەڕەتییە کە گۆڕانی حکوومەتی عوسمانیەکان لە مۆنارشییەتی ڕەهاوە بۆ حکوومەتی یاسایی و مەشرووتییەت دیاری دەکات. دوای ئەوەی سولتان عەبدولحەمید، لە ئەنجامی هەوڵدانی ئەورووپیەکان و کەسانی وەکوو مەدحەت پاشاوە، ساڵی ١٨٧٦ (٣١ی ئاب) هاتە سەر دەسەڵات، باسی دانانی دەستوورێکی بنچینەییش هاتە ئاراوە. لەباتی ئەو چوارچێوەیەی کە

مەدحەت پاشا بەناوی یاسا تازەکانەوە ئامادەی کردبوو، سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی وەرگێڕانی دەستووری بنچینەیی‌ی فەرەنسای دەرکردو داوای لە ئەنجومەنی وەزیران کرد چوارچێوەیەکی تازە ئامادە بکەن. دوای ئەوەی چوارچێوەی داواکراوی دەستوور، لەلایەن دەستەیەکی بیست‌و سێ کەسییەوە ئامادەکرا، ئەنجومەنی وەزیران دواین شێوەی پێداو خستیە بەر دەستی پادشاو، دواتریش لەلایەن پادشاوە ڕاگەیەندرا (٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٦) ئەم دەستوورە لە ئیرادەی یەکلانەیەی پادشاوە سەرچاوەی دەگرت‌و، بەر لە هەمووشتێك بنەما باوەکانی بەڕێوەبەرێتی‌ی دەوڵەتی عوسمانیی ڕەچاو دەکرد.

مافی پادشایەتی، بەگوێرەی ئەمە، هی کوڕان‌و نەوەکانی عوسمانەو هەموو کەس‌و لایەنێکیش ئەمە زامن دەکات. لەگەڵ ئەوەیشدا کە پادشا زۆربەی دەسەڵاتەکانی دەمێنێتەوە، دیسان بەرامبەر بە شتەکان هیچ بەرپرسییەکی نییە. هەمان کات پادشا خەلیفەشەو ڕێ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە دینیەکان خۆش دەکات. پادشا، سەدری ئەعزەم (سەرۆك وەزیران)و یەك بە یەکی وەزیران‌و (شێخول ئیسلام) دیاری دەکات‌و ئەرکیان پێدەدات. لەبەر ئەوە وەزیران بەرامبەر بە پەرلەمان بەرپرس نین، بەڵکوو دەبێ وەڵام بە پادشا بدەنەوە، پادشا دەتوانێ ماوەی کۆبوونەوەی مەجلیسی گشتی (ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك‌و سەناتۆ) کە ئۆرگانی یاسادانانی دەوڵەتە، کورت یا درێژبکاتەوە. تەنانەت دەتوانێ، بە مەرجی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی تر، مەجلیس هەڵوەشێنێتەوە. ئەندامانی بەشی (هەیئەتی ئەعیان)، یاخود سەناتۆی مەجلیسی گشتی، لەلایەن خودی پادشاوە دیاری دەکرێن. هەردوو بەشی مەجلیسی گشتی (هەیئەتی ئەعیان‌و ئەنجومەنی مەبعووسان یاخود نوێنەرانی خەڵك) بەرامبەر بە پادشا سوێندی وەفاداری دەخۆن‌و دەست بەکاری خۆیان دەکەن.

ئەو ئۆرگانەی کە دەستووری بنچینەیی بۆ یاسادانان دەست نیشانی کردبوو، بە شێوەیەکی گشتی لە ١٩ی مارتی ١٨٧٧ـەوە تا ١٦ی شوباتی ١٨٧٨، لەگەڵ ئەوەدا کە جاروبار دابڕانی تێدا دروست دەبوو، نزیکەی پێنج مانگ بەردەوام بوو لەسەر کاری خۆی. بەڵام لەم ماوەیەدا، لەبەر ڕەخنەکانی خۆی، ڕق‌و تووڕەیی‌ی پادشای هەستاند. هەر لەبەر ئەمەش سوڵتان عەبدولحەمید شەڕی دژی ڕووسیای کرد بە

خەڵك. لە ئەنجامی خراپییەکانی ستەمکاریو داپڵۆساندندا، پێکەوە نەگونجانو بێجموجووڵی لەنێو خەڵکدا و نەفرەتێکی ترسناکیش لەنێو بنەماو توخمە سەرەکیەکاندا باو بوو.

ئەو ڕۆژە گەورەیەی (١٠ی ئاب)، ئەم هەموو پیسایی‌و نەفرەتە ڕووخێنەرو دوژمنایەتیەی پاك کردەوەو کوژاندیەوە. بەڵام دوای سەرکەوتن، خەڵکی عوسمانی وایاندەزانی لەم شۆڕشەداو بەتایبەت دوای

---

بەهانەیەكو مەجلیسی گشتیشی خستە ناوو جارێکی تر بانگی نەکردنەوە بۆ کۆبوونەوە. لەمەودوا تا ساڵی ١٩٠٨ هەرچەندە لە باری یاساییەوە دەستوور وەکوو خۆی مابووەوە، بەڵام بە شێوەیەکی پراتیکی بەکار نەدەهێنرا. لەگەڵ ڕاگەیاندنی دووبارەی مەشرووتییەتدا (مەشرووتییەتی دووهەم) دەستووری بنچینەیی کەوتەوە مەیدانی جێبەجێکردن. دوای ڕووداوی ٣١ی مارت، هەندێك گۆڕانکاریی بەرچاو لە دەستووری بنچینەییدا کراو سیستمێکی مەشرووتەخوازو پەرلەمانتاری دامەزراو، ئیدی پادشا لەبەردەم دەستوورو پێکهێنانیدا بە بەرپرس دەزانراو، ئیدی بە پێچەوانەی جارانەوە حکوومەت وەڵامی بە پادشا نەدەدایەوە، بەڵکوو ڕاستەوخۆ بەسترابووەوە بە ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکەوە. بە واتایەکی تر، حکوومەتو ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك کەسایەتیی سەربەخۆی خۆیان بەدەست هێنا. شایانی باسە، هەندێك ماف و ئازادیی وەك دروستکردنی کۆمەڵەو ڕێکخراو، مافی کۆبوونەوە بە شێوەیەکی ڕەسمی بە یاسا لەم دەستوورەدا چەسپێندرا.

دوای دەست پێکردنی یەکەم شەڕی جیهانیو سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، دیسان وەکوو جاری پێشوو دەستووری بنچینەیی نەخرایە مەیدانی پیش پێکردنەوە. لە قۆناغی شەڕی ڕزگاریدا، تەنانەت ساڵی ١٩٢١، ڕێکخستنی سەرەکیی یاسا بڕیاری دا ئەو بەندانەی دەستوور کە لەگەڵ دەستووری تازەدا ناکۆکییان نییە، وەکوو خۆیان بمێننەوە. ساڵی ١٩٢٤، هەر ئەم ڕێکخستنە دەستووری تازەو ئەوەی ساڵی ١٩٢١ی پێکەوە هەڵوەشاندەوە.

ئـەم شۆڕشـە خێـرداره کـە ئێستا ئێمـە خەڵکەکـەیمان ملکەچـی حکوومـەتی داخراوی عەسکەری کردووه، لەنێو میانڕەوییەکداو بە کێبڕکـێ لەگـەڵ مرۆڤە ئازادەکانــدا دەژیــن. پێگەیــشتوویيەکیان بەرامبــەر بـــە کۆبوونـــەوە ڕاگەیانـدراوەکان تـا هـەر ئازادییـەکی تـر نیـشان دا. هـیچ کاتێـك سـنووریان تێپەڕ نەکردو گەیشتنە ئەو ئاستەی کە ئەورووپاییـەکان سەریان لـە ئاسـتی ئەمـەدا سوڕماو گوتیـان ((ئـەم خەڵکـە چەند سـەیره ! چۆن و چ کاتێك فێـری ئەم زانیاری و پەروەردەی ئازادییە بوون ؟)).

ئـەم بارودۆخـە تـا ماوەیـەك هـەروا بـەردەوام بـوو. مەشـرووتییەت، بەرەکـەتی خـۆی لـە هەرلایـەکی ئـەم وڵاتـەو سـەر هـەر کەسێكو هـەر دەسـتەیەك ئاشـکرا کـرد. لـە مەیـدانی ڕاگەیاندنیـشدا، ڕۆح و جـۆش و خرۆشێك هەبوو. کۆبوونەوەی زانستی، ئەدەبی، سیاسی لەنێو خەڵکدا دەکـراو، دەسـتەو گرووپـی جیـاواز پێـك دەهێنـران. بـە کـورتی، ئێمـەو دنیـاش لـە شۆڕشـەکەمان ڕازی بووین. بـەڵام کەسـانێکیش هـەبوون لـەم بـەختیاری و ئاسـوودەیی و بەرزبوونەوەیـە ڕازی نـەبوون. ئەمانـەش ئەوانە بوون کە دەیانویست بـە بەکارهێنانی ئـەم شۆڕشـە ستەمکاری و داپڵۆسـین بخەنــە کــارو زۆر ســەرکەوتوو نــەبوون. شـتێکی ســەیره، دەرکـەوتنی بەرەکـەتی ئـەم مەشرووتییەتەو وڵاتەکـەمان ئـەم کەسـانەی لەژێرەوە بێـزار دەکـردو وای لـێ دەکـرن ناهـەقی و خراپـەکاری بکـەن بۆ بەرژەوەنـدی خۆیــان. ئــەو بەســەرهات و ناســۆری زەحمەتانــەی وا مەشـرووتییەت بەخۆیـەوە دیـوني و مـن هـەوڵ دەدەم یـەك لـەدوای یـەك باسیان بکەمو بیانسەلمێنم، هـەمووی لەسـەر ئـەم بنەمایـەو بـەپێی ئـەم خراپکاریانە دەرکەوت.

ئەو قارەمانە درۆینانەی کە بە درۆوەو بەناوی تێکۆشەری ڕێگەی ئازادییەوە خۆیان لەقەڵەم دەدا، بە شێوەیەکی نهێنیی و شاراوە کەوتنە تێکدانو گڵاوکردنی باشیی و چاکیەکان، چونکە ئەو مەشرووتییەتە گەورەیە لە بایەخی ئەوانی کەم دەکردەوەو هیچ‌وپووچییانی دەخستە بەرچاو. ئەمەش، بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەوان، شتێکی گونجاو نەبوو.

ئەوکاتەی دەورانی خۆنواندنو چەپڵەلێدان کۆتایی پێ هاتو بەسەرچوو، وەختی هەڵبژاردن هات. ئیدی بە شێوەیەکی ئاشکرا کەوتینە ناو فێڵو تەڵەکەبازی لە هەڵبژاردندا، کۆمەڵە -کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی- تەنیا بە دەست تێوەردانو جۆرکردنی چەند کەسێکی چاوچنۆك، هەموو توانایی و هێزێکی خۆی بۆ پاراستنی بەرژەوەندەکانی بەکار هێناو، لەو ڕێگەیەدا تەنانەت بنەماکانی مەشرووتییەتیشی پێشێل کرد. لەکاتێکدا خەڵك بە زانایی و نەزانییەوە بە شێوەیەکی سوپاسگوزارانەو ڕێزلێنەرانە تەماشای سوپایان دەکرد، لەملاشەوە دەیانویست بەگوێرەی ویستو خواستی جۆراوجۆر، شێوە بە کۆمەڵە بدەنو، گەمەیەکی زۆریان لەسەر ئەم باباتە کرد. پارچەپارچەکردنی ئەو یاسا بنەڕەتیەو ئازادیە پیرۆزەی کە تازە گەیشتبوە ئەنجامی خۆی، بەهۆی هێرشێکی چاوچنۆکانەوە، شتێکە نابێ شایستەی (پیاوە گەورەکانی ئازادی) بێ، کە دڵیان بە ویستو لافوگەزافی پێشەنگایەتیی ڕێگەی مەشرووتییەت لێی دەدا. لەبەر ئەوەی کە وەهاش بوو، لەملاو لەولاوە گلەیی و سکاڵا دەستیپێکردو، تێکۆشانی سیاسی بەناوی یاساوەو لەپێناوی ئازادیدا کەوتنە مەیدانەوە. خۆی لەبنەڕەتدا یەکێکی ئەو هۆیانەی کە بوو بە مایەی بەهێزبوونی ئەو نارەزاییانە، کۆکردنەوەی پارمەتی بوو بۆ کۆمەڵە.

بڕی ئەو پارەیەی کە بەناوی گەلەکەمانەوە لە خەڵکی ڕەشۆکی وەردەگیرا، زۆر نەبوو. بەڵام دزیی زۆر لەو پارەیەی کە بە زۆرەملێ و بەبێ هیچ هۆیەکی تر لە کۆنە دەوڵەمەندو پیاوماقووڵو ناوداران وەردەگیراو تاکوو ئێستاش برە ڕاستەقینەکەی بەشاراوەیی ماوەتەوە، دەکرا. لەمەبەدوا ئیدی قۆناغی قۆرخکردنی دەسەڵاتو نیشتمانپەروەریو، بەتایبەت قۆناغی تۆمەتبارکردن دەستی پێکرد.

هەموو پێکهاتەکانی وڵاتی عوسمانی لە موسڵمانو فەلەوە بگرە تا کوردو ئەرمەنیو تەنانەت دەستەو توخمەکانی نێو نەتەوەیەکیش، سالانێکی دوورودرێژ پێکەوە لەناو ناکۆکی و پێکدادانەدا ژیاون. ئەوکاتەش گرووپی (ئیتیحادو تەرەقی) هاتنە سەر حوکم، خۆیان بە لاوانی تورك (ژۆن تورك)[٥] لەقەڵەم دەدا. بەهۆی ئابوورییەکی دەوڵەتیی سەرسوڕهێنەوە، چارەنووسی نەتەوەییمانیان بەرەو هەڵدێر بردو، لەبەر ئەوەی کە دەیانویست بە هەرشێوەیەك بێ دەسەڵاتی زیاتر

---

[٥] ژۆن تورکەکان، (Jeune Turc)، وشەیەکی فەرەنسییە بە واتای (تورکی گەنج)، بەو کەسو ڕێکخراوانە دەگوترێ کە بەتایبەت سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم لە دەرەوەی وڵات بەشداریی ڕیزەکانی ئۆپۆزیسیۆنیان کردووە. ئەم وشەیە کراوە بە تورکیو، وەکوو "تورکی گەنج" بەکارهێنراوە. ئەو عوسمانیانەی کە دژایەتیی سیاسیی عەبدولعەزیزیان دەکرد، بە ژۆن تورکەکانو بزووتنەوەکانیشیانەوە، بە بزووتنەوەی یەکەمی ژۆن تورك ناوزەد دەکرا.

بەڵام ئەم ناوە زیاتر بۆ ئەو ڕێکخراوە عوسمانیانە بەکار دەبرێ کە لەکاتی سوڵتان عەبدولحەمیددا هەوڵی ڕووخاندنی حکوومەتیان دەدا لە دەرەوەی وڵاتەوە. لەبەر ئەمە کۆمەڵی ئیتیحادو تەرەقی ویستوویەتی ئەم ناوە بۆ خۆی بەکار بێنێو بایەخی پێ داوەو، ئەندامەکانی خۆشی بە "ئیتیحادچی" ناو بردووە.

بگرنه دەست، نەیاران و دوژمنانی خۆیانیان سەرکوت دەکرد (هەروەك نەریتی پێشینە) و بەم جۆرە ڕەنگی ڕێکخستنێکی سەرەڕۆو فراوانخوازو هەڕشەکەری لێ نیشت. ئەو شۆڕشی مەشرووتەیەی کە بە شێوەیەکی گشتی ڕێزی لە مافە سیاسییەکانی تاك و کۆمەڵەکان دەگرت و باسی یەکسانیی تاك و کۆمەڵەکانی بەرامبەر بە یاسا دەکرد، نەدەشیا مافی زۆرداری و فراوانخوازی بە شێوەیەکی ماددی و مەعنەوی بدات. ڕێکخستنێك کە بە شانازیکردن بە بەرپاکردنی شۆڕشەوە خۆی پێش خستووە، خۆسەپێن و دژی مەشرووتییەت و لەناوبەری ئازادییە. لەگەڵ ئەمەدا کۆمەڵە، لە کاروباری هەڵبژاردندا، بە کەڵك وەرگرتن لە پاشاگەردانیی ئەو کاتانەو، بەتایبەت لە نەزانی و کەمتەرخەمیی خەڵکەکەمان کە بە تەواوی لە سنوورەکانی ئازادی (وەکوو مەشرووتییەت چییەو هەڵبژاردن چۆن دەبێ) تێنەگەیشتبوون، دەستی بە پیلانگێڕی و گەمە کردو کێشە گرنگەکانمانی وەکوو ئاشتیی نەتەوەکان و پێکهاتنی بنەماو توخمەکان ئاڵۆزتر کرد. بۆ ئەوەی بەسەر ئەم هەموو کارانەدا زاڵ ببێ و سەرکەوتوو دەرکەوێ، پێویستی بە هێزێکی داپڵۆسێن و تێنەگەیشتوو بوو. ئەویش هەمان هێزی عەسکەری بوو، بەسایەی ئەمیشەوە کەوتە فشارو تەنگ پێ هەڵچنین و خۆسەپاندن و بەکارهێنانە خراپە بێ کۆتاییەکان.

ئیتیحادو تەرەقی لەناوەوە لەڕێگەی فەرمانە نهێنییەکانی خۆیەوەو، لە دەرێشەوە بەهۆی سەربازەکان و هێزی چەکداری یارمەتیدەری خۆیەوە (بۆ نموونە، وەکوو کۆمەڵی تاوانبارەکانی سیرۆن) زوڵم و زۆریان بەرامبەر بە خەڵکە بێزارەکەمان بەکار دەهێناو بەبێ هیچ

شەرمێك بنەمای ڕایژۆكاریی شۆڕشی مەشرووتەیان دەنایە ژێر پێو، تەنانەت لە هەندێك جێگاشدا بە زۆری چەك هەرەشەیان لە خەڵكە دووبارە تاوانكراوەكان دەكرد. بەم جۆرە ئەم كۆمەڵە بوو بەهۆی دوورخستنەوەو ساردكردنەوەی هەموو پێكهاتەو بنەماكانی ئەم وڵاتە لە ئاشتی. لەوەش زیاتر، لە ڕێگەی "شوورای ئوممەت"[٦] و چەندین ئۆرگانی ڕاگەیاندنی ترسنۆك‌و ماستاوچی‌ی ترەوە، هەوڵی بەدرۆخستنەوەی هەواڵی ئەنجامدەرانی ئەو ڕەفتارانە دەدرا كە بە شێوازێكی نهێنی (ئەم جۆرە یاخود بەو جۆرە) بڕیاریان لەسەر درابوو و جەستەی مەشرووتەیان پێ برینندار كردبوو. خۆی لەبنەڕەتدا كاتێك "تەنین-طنین"[٧] دوای ماوەیەك دەستی بە شاردنەوەو داپۆشینی كارە نەگونجاو و گەندەڵیە پەردە لەڕووهەڵماڵراوەكانی خۆی كرد، بە

---

[٦] "شوورای ئوممەت" ڕۆژنامەیەكە ژۆن توركەكان لە (١٠ی نیسانی ١٩٠٢)ەوە لە پاریس دەریان كردووە. یەكەم سەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیە "سامی پاشازادەی سەزایی" بووە. ڕۆژنامەكە سەرەتا زمانی‌حاڵی سیاسەتی عوسمانی بووە. بەڵام دواتر ئیتیحادچییەكان كۆنترۆڵیان كردووە (١٩٠٦). ئەم ڕۆژنامەیە "د. بەهادین" لە ئەستەنبووڵ بەرپرسی بوو و بە شێوەیەكی بەردەوام دەردەچوو، ساڵی ١٩٠٨ بوو بە ئۆرگانی ڕاگەیاندنی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی.

[٧] "تەنین-طەنین" ڕۆژنامەیەكی سیاسی‌ی ڕۆژانەیە، دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتەی دووهەم لەلایەن "جاهید یالچین، تۆفیق فیكرەت، حوسەین كازم قەدری"یەوە دامەزرا. یەكەم ژمارەی ١ی ئابی ١٩٠٨ دەرچوو و كاتی ڕووداوی ٣١ی مارتیش چاپخانەكەی ڕووخێندرا. دوای ماوەیەك لە دەرچوونی، كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی‌و كڕیی‌و بوو بە ڕۆژنامەیەكی ئەوان. جێی باسە، بەر لەوەی ئەوە ڕوویدات، تۆفیق فیكرەت‌و حوسێن كازم قەدری لە ڕۆژنامەكە جودابووبوونەوە. دوای هەموو ئەمانەش، دیسان حوسەین جاهید یالچین ناوەناوە ئەم ڕۆژنامەیەی دەردەكرد.

بڵاوکردنەوەی بۆچوونی بێجۆرێی سەربەخۆیی لەلای ئەم و ئەو و دروستکردنی ئامانجی شۆڕشگێرانەو ڕاپەڕینخوازی، تۆوی دوژمنایەتی و دڵشکان و لەیەك زیزبوونی لەنێوان هەر نەژادو پێکهاتەیەکی وڵاتی عوسمانیدا، لە ڕۆمی و ئەرمەنییەوە بگرە تا عەرەب و ئەلبانی، وەشاند. کە چاومان بەم بارودۆخانە دەکەوت، لەدەروونەوە ئازارمان دەکێشاو خەفەتمان دەخوارد. دوای سەرکەوتن، دەبوایە وای لێ بهاتبایە ؟ ئێمە هێشتا لە باوەشی ڕابردوودا هەڵبەزو دابەزمان بوو. مادام بنەماکانی شۆڕشی مەشرووتە پەسند کرابوون و پێڕەویکردنی یاسای بنەڕەتی بە کارێکی گرنگ لەقەڵەم دەدرا، پێویست بوو چالاکی و بیرو بۆچوونی هەر کەسێك لە چوارچێوەی ئەم یاساو بنەمایەدا ئازاد بوایە. بەڵام لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئەم مافە ڕەوا و سروشتییە لەلایەن هەندێك کەسەوە لەگەڵ بەرژەوەندەکانی ئەواندا نەدەگونجا، هەوڵیان دەدا ئەم کەسانە لەبەردەم ڕای گشتیدا سووك بکەن و پچووکیان بکەنەوە، تۆمەتی نادیاریی باوك و دایك، خیانەت بە نیشتمان، دوورەپەرێزییان بخەنە پاڵ. وەك ئەوە وابوو کە مەشرووتە تەنیا موڵکی کۆمەڵە بێ. هەر کەسێك بیری لە نیشتمانەکەی بکردایەتەوەو ئارەزووی پێشکەوتن و بەشارستانیبوونی وڵاتەکەی لەسەردا هەبوایە، پێویست بوو ببێتە ئەندامی کۆمەڵە. "بیرو بۆچوونی پێشکەوتوو، نیشتمانپەروەری، پارێزگاری" و هەموو شتەکانی تر، ئەوان پاوانیان کردبوون. بۆ ئەوەی بتوانی کەڵك لەو شتە قۆرخکراوانەو بەتایبەت مەشروتییەت وەربگری، پێویست بوو ((کلیلەکانی بەهەشت لە پاپا بکڕی))، چونکە جگە لەوەی کە

بەرپرسـانی ئـەم ڕێکخـراوە دەیـانگوت کۆمەڵـە سـوودی نـەبڕاوەی باوکایـەتی‌و پارێزگـاریی هەیـە، شتێکی تـریش لـەئارادا بـوو، ئـەویش پیرۆزییەکی تری بێکۆتایی بوو، یانی وازنـەهێنانی ئـەم ڕێکخـراوە بـوو لە دووبارەکردنـەوەی باسـی گـەورەییی خۆی و، لەبـەر ئەمـەش هـەوڵی بەدەسـتهێنانی پێگەیـەکی مەعنـەویی دەدا وا کـە هـەموو کەسـێك کڕنۆشی بۆ بەرێ. ئای مەشرووتییەتە بێچارەکەی ئیتیحاد.. ((ئایا بەیانی شەوێکی وەها ڕۆشنایی‌و خێری تێدایە، یان نا!)).

## من‌و ئەوانەی لە ئەوروپا بوون

لـە ڕابـردوودا وەکـوو ڕۆژی ئـەمڕۆ، هـەروەك چـۆن ئەورووپیـەکان باوەڕیـان بـە پایەبـەرزیی دونیـای زانـست هێنـابوو، ئێمـەش لـە دەوروبـەری ئایـدیالێکی پایەبڵنـدو چارەسـەرێکی ڕزگـارکردنی وڵاتەکـەمان لـە مەترسـیی لەناوچـوون‌و دواکـەوتن کۆبووبووینـەوە: مەشـرووتییەت، ئیرادەیـەکی ئـازادو ڕۆشـن، حکوومـەتێکی پێشکەوتنخوازو دادپەروەر، ئازادی‌و خۆشـی‌و بەختیاریی داهـاتووی خۆمان لەم ئارەزوانەدا دەبینییەوە کە لەگەڵ سەربەستیەکاندا کێبڕکێیـان بـوو. هـەروەها لەدڵـەوە هیواخـوازی پێشکەوتن‌و بەرزبوونـەوەی وڵاتـە لێقەوماوەکەمان بووین. شـەڕ، سـەرتاپای وڵاتەکـەمانی داگیر کردبـوو. ئـەم وڵاتـە لـە ئاوەدانکرنـەوەو شارسـتانی‌و تێگەیـشتن بێبـەش بـوو. خەڵکەکـەشمان لـە قووڵاییی نـەزانی‌و کەمتەرخەمیـدا ژیانیـان بەسـەر دەبـرد. هـیچ نیشانەیەکی بـچووکیش لـە نیـازی بـاش‌و کـاری دەسـت پێـشخەرانەی ئیرادەکـەشمان (مەبەسـت دەسـەڵات) لـەئارادا نـەبوو.

بەشێوەیەکی گشتیی و ڕاستەوڕاست، بە کوێرایی‌ی ویژدان و دەروونی خۆمانەوە، بە پەلە بەرەو زەلکاوی لەناوچوون و تاریکایی دەڕۆیشتین. حکوومەتی پێشوو، لە ساڵی یەکەمی شادی و بەختیاریدا، لە یەکەم ساتەکاندا، بە سەرەڕۆیی و زۆرداری‌ی خۆی، یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتەی کە بە هەوڵدانە ئازایخوازەکانی پیاوی بەشەرەف و شەهیدی بێتاوان "مەدحەت پاشا"[(٨)] ئامادەی جێبەجێکردن کرابوو، خستە ژێرپێ و، دوای ئەو تاوانە چەپەڵە، بە هەموو هێزێکی خۆیەوە وەك جاران دەستی کرد بە دوژمنایەتیکردنی ڕووناکی و خۆشی و بەختیاری و پێشکەوتن. دووبارە هەمان ڕێگەی پەرێشانی و

---

(٨) ناوی ڕاستەقینەی "ئەحمەد شەفیق"ـە و ساڵی ١٨٢٢ لە ئەستەنبووڵ لەدایك بووە. ساڵی ١٨٨٤ یش لە (تایف) ژیانی خۆی لەدەست دا. ناوبراو، یەکێك بوو لە گەورە بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی. "ڕوسچوکلو حاجی ئەشرەف ئەفەندی"ی باوکی، لە زۆر جێگە کاری دادوەریی کردووە. لە تەمەنی دە ساڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەرکردو، بوو بە (حافزی قورئان). لە تەمەنی سیانزە - چواردە ساڵیدا، لە قەڵەمی (دیوانی هومایۆنی) دامەزراو، ناسناوی "مەدحەت"ی بۆ خۆی هەڵبژارد. بەدەم ئەم کارەشەوە، خوێندنی خۆی لەلای مامۆستای تایبەت درێژە پێداو، فێری زمانی عەرەبی و فارسی بوو. دوای ئەوەی بوو بە سی‌وپێنج ساڵ، فێری زمانی فەرەنسیش بوو. شایانی باسە، مستەفا ڕەشید پاشا پارێزگاری لێ دەکردو ڕێگەی پێشکەوتنی بۆ دەکردەوە. دواتری ئەرکی نووسەری، پارێزگاری، نوێنەرایەتی‌ی پارلەمان، سەدری ئەعزەم (یا سەرۆك وەزیران)ی وەرگرت. ڕۆڵێکی کاریگەری لە لابردنی عەبدولعەزیزدا لەسەر تەختی دەسەڵات هەبوو. سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم لەپێشدا کردی بە سەرۆك وەزیران و، دواتریش کە عەبدولعەزیز مرد، بە تاوانی ئەوەی کە پەیوەندیی لەگەڵ (عەبدولعەزیز)دا هەبوە، موحاکەمەی کردو، لە ئەنجامدا دوورخرایەوە بۆ (تایف)و، هەر لەوێش کوژرا.

بەدبەختیی جارانمان گرتەوە بەر. بەم جۆرەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژو سات بەسات زیاتر دەتواینەوەو، لە باری مەعنەویو ماددیشەوە ڕوومان لە دابەزینو بێهێزی کردبوو. پاشایەتیی ستەمکار کە لەباتی دەسەڵاتی نەتەوەیی هاتبوە سەر کار، بە بەکارهێنانی توندوتیژی دەرهەق بە ئازادیخوازانو ئارەزووی لەناوبردنی هەمیشەییی ئەوان، ئاستەنگی لەبەردەم بیرو بۆچوونو قەڵەمو ڕاوێژکاریو بنەماو دەستکەوتەکانی ئازادیدا دروست دەکرد. ئێمە سامناکترین دوژمنی ڕاستەقینەو ئۆپۆزیسیۆنی خەفەتبارو بێهیوای ئەم سەرەڕۆییو زۆردارییە چەپەڵو ناسۆراوىو ئیرادە کوێرە بووین. لە ئەورووپا وەك ئەوەی کە ئەمڕۆ خۆشیان دانی پێدا دەنێنو ڕەتی ناکەنەوە، ئەوی سەبارەت بە مەشرووتییەت سەری لە ئێمە دەدا، بۆی تێدەکۆشاینو خۆمان لە هاوکاریکردنی نەدەدزییەوە. ئێمە لەبەر شانوشکۆو پلەوپایە بەشداریمان لە کارەکانی تایبەت بە مەشرووتییەتدا نەکردووە، بەڵکوو بە شێوەیەکی شاراوەو لەبەر خاکیبوونو سادەییی خۆمان بەشداریمان لەم کارانەدا هەبوە، چونکە مەبەستمان لەم دژایەتیو ناڕەزاییدەربڕینە، بەرزبوونەوەو پاراستنی بەرژەوەندی تاکەکەسیی خۆمان نەبوو. خۆی لەبنەڕەتدا ئەوە بە ئەندازەی پێویست دەرکەوت کە ئێمە لەو جۆرە ئارەزوە تاریكو ڕەشانەوە دوور بووین. دوو پارتی شۆڕشگێر لە ئەورووپا، بە تایبەت لە پاریس، هەبوو، پارتی "سەباحەدین ئەفەندی"[(٩)] و تێکۆشەرانی "ئیتیحادوتەرەقی". ئێمە

---

[(٩)] سەباحەدین بەگ، شازادەیەکە، ساڵی ١٨٧٨ لە ئەستەنبووڵ لەدایك بووەو، ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٤٨ لە سویسرا ژیانی خۆی لەدەست داوە. ناوبراو، یەکێك

بەپێی توانایی‌و بۆ یارمەتیدانی ئەم دوو پارتە تێکۆشەرە، بەشداریی ماددی‌و مەعنەویمان لە کارەکانیاندا بە شانازی دەزانی. سەرەڕای تووڕەیی‌و نەفرەتی عەبدولحەمیدو هەبوونی ئەگەری دەرکران‌و بە مەترسییەوە وەرگرتنەوەی ئەرکەکەمان، بەبێ‌ترسانە گەنجە دوورکەوتوەکانی وڵاتمان پاراست. هەواڵی پەیوەندیەکانی من لەگەڵ "ژۆن تورک"ـەکاندا، بەزوویی گەیشتەوە ئەستەنبووڵ. بۆیە فەرمانی وازهێنان لە ئەرك‌و گەڕانەوەم بۆ ئەستەنبووڵ پێدرا. ئەم هەموو ئاستەنگانەی عەبدولحەمید نەیانتوانی ببنە ڕێگر لەبەردەم بیرو بۆچوونی ئازادیخوازانەی مندا. لەڕاستیدا ئەم بەڕێوەبەرێتیەی ئێستاش دیسان وەك جاران پەنای بردوەتەوە بە تەگبیرو ڕێوشوێنە کۆنەکان. ئایا ئەمە، بە شێوەیەکی پڕ لە پەرێشانی‌و ئازار، تووشی

---

بووە لە بیرمەندەکانی دەورانی کۆتایی‌ی ئیمپراتۆریای عوسمانی. لەبەر ئەوەی کوڕی سەنیحە سوڵتانی کچی عەبدولمەجیدو باوکی "داماد مەحموود جەلالەدین پاشا" بووە، بە شازادە بانگیان کردووە. بە شێوەیەکی تایبەتی پەروەردەکراوە، دواتر لەگەڵ باوکیدا بەرەو ئەورووپا چووەو ڕایان کردووە. لە پاریس، چەندین نووسراوو وتاری جۆراوجۆی لە ڕۆژنامەو ئۆرگانەکانی ڕاگەیاندنیدا بڵاوکردەوە.

دواتر لە (١٩٠٦-١٩٠٨)دا گۆڤارێکی مانگانەی بەناوی "تەرەقی"یەوە دەرکرد. ساڵی ١٩٠٨ و دوای شۆڕش گەڕایەوە بۆ ئەستەنبووڵ‌و، بیرو بۆچوونەکانی خۆی لە چوارچێوەی (دەست پێشخەری‌ی تایبەت‌و ڕەتکردنەوەی ناوەندخوازی‌و پاوانکاری)دا لە سێ کتێبی بچووکدا بە ناوەکانی "ڕوونکردنەوەی یەکەم‌و دووهەم‌و سێهەم"ەوە بڵاوکردەوە. لەبەر دژایەتیکردنی کۆمەڵی ئیتیحادو تەرەقی، ناچاریان کرد دووبارە بچێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات. دوای دروستبوونی کۆماریش، لەبەر ئەوەی یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی عوسمانی بوو، ڕێی پێنەدرا بگەڕێتەوە.

شکست نەبوو ؟ لە ئەنجامیشدا ئەمڕۆ پاشماوەو بەشەکانی ئازادیخوازی دان بەوەدا دەنێن کە ئێمە لە دەورانی پێشوودا یارمەتیمان داون. خودا دەزانێ. من نەمدەویست بە هیچ شێوەیەك باسی ئەم شتانە بکەمو ڕوونیان بکەمەوە. ئەمانە بە مەبەستی خۆگەورەکردن و خۆپەسندان ناهێنمە سەر زمان، بەڵکو بەداخەوە هەلومەرجی ئێستا، لەبەر پاراستنی ناموسو پارێزگاری لەخۆکردن، ناچاری ئەمەی کردم. لەلایەکی تریشەوە، سوپاسگوزارین کە ئێمە کەسێکی بەو ئەندازەیە کەوتوو نین کە ئەرکی بەجێهێنانی قەرزاریمان بەرامبەر بە وڵات، بە هەندێك شتی ئاسایی بگۆڕینەوە. ئێمە تەنیا ئەرکی خۆمانمان بەجێهێنا. ئێستاش بە هەمان شێوە پابەندی هەڵوێسەکانی خۆمانین. ئەمەش ڕوویەکی سەیری ڕووداوەکانە. "ڕزگارکەرانی-نەتەوە" کە لە ئەورووپاو ڕۆژئاواوە هاتبوون، لەبەر تەنگ پێهەڵچنین و گوشاری هەلومەرجی ئەوکاتە، بە کەڵکوەرگرتن لە پلەوپایەکانی خۆیان، هەوساری دەسەڵاتی بەڕێوەبەریتی ئەم وڵاتەیان گرتە دەست. دوای ئەم سەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوانە (هەرچۆنێك دەبێ با ببێ ئەوانە "کۆمەڵ"[٢] شۆڕشیان بەرپانەکرد)، داروودەستەی ئیتیحادو تەرەقی ئێمەشیان خستە ناو وەفدەکانیانەوە. شایانی وتنە، ئێمەش دووبارە لەبەر بیری پێشکەوتنی وڵات و پتەوبوونی پایەکانی مەشرووتییەت، هاوبەشیی ئەمانەمان کرد. ئێمە ئەوکاتانە هەم گەورە بووین، هەم وڵاتپارێز، چونکە هێشتا دژایەتیمان نەدەکردو بە ئاشکرا بەرامبەر بە ناهەقی و ستەمکاری و کوێراییەکانیان دەرنەکەوتبوون. بەڵام لەدوورەوە، بە خەفەت و ئازارەو ترسەوە،

تەماشای ئەو بارودۆخە نەگونجاوە پڕ لە گەندەڵیەمان دەکرد کە بنەماکانی مەشرووتییەتیان دەڕووخاندو، ئێمەش لەسەرەوە باسی هەموویمان کرد. زۆر بە ڕاستیش لە ئاکامەکان دەترساین. ئێمە بەشداریی سوپاو سەربازەکانمان لە سیاسەتو کاروباری حکوومەتو دەستێوەردانی چارەنووسی نەتەوەییدا بە هەڵەو تاوانێکی لێنەبوردراو لەقەڵەم دەداو، جاروبار بە ناسکیو بە زمانێکی نەرمەوە دەکەوتینە باسی ئەوە بۆ هاوڕێیانمانو هاوڕێکانی کلووپ کە ئەم زۆردارییە خراپەی وا سوپا لەڕێگەی حیزبایەتییەوە دەیکات، لەئەنجامدا مەشرووتییەت تێك دەداتو وڵات وێران دەکات. زەمینەی ئازادی، شایستەی ئەمجۆرە شتانە نییە. ئەمە خۆی لەخۆیدا کۆسپ لەبەردەم پێشکەوتنماندا دروست دەکات. ئەو ماوەیەی کە لە (کلووپ) ئەندام بووین، لەبەر ئەوەی کە لە بەرپرسیی ویژدانیی خۆمان دەترساین، ناڕەزاییی خۆمان بەرامبەر بە هەر هەڵەیەکی بچووك- گەورە دەردەبڕی. لەم بارەیەشەوە، لە هەموو کەسێك زیاتر مافێکی سروشتیی ئەزەلیو پڕ لە بەختەوەریمان هەبوو. ئێمە، لەبەر بەرژەوەند یاخود کەسێتیی ئەوانەی کە لە ئەورووپا بوون، دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ نەکردبوونەوە. بەڵکوو تەنیا لەبەر نیشتمانو مەشرووتییەت هاوکاریمان کردبوون. لەبەر ئەوەشە، ڕۆژی ئەمڕۆمان وڵات لە کەسو مەشرووتییەتیش لە کەسێتی گرنگترەو، هەمیشەش وەها دەمێنێتەوە. ئێمە هیچ کاتێك سواڵی دۆستایەتیو بایەخپێدانێکی ناپێویستو بێواتامان لە هیچ کەسێك نەکرد، بەڵکو تەنیا داواکاری هەقو ڕاستی بووینو هەروەهاش دەبین. لەبەر ئەوەی

ئێمە قەرزارو ناچاری پەسندان و بەرزکردنەوەو بەباڵادابڕینی هیچ کەسێکی ناشایستە نەبووین، ئاوها نارەزایی خۆمان (هەرچەندە تاڵیش بێ) لەسەر هەر بابەتێك دەردەبڕین و بەناوی مافەوە ئەو مافەی خۆمان ناکەینە قوربانی. ئەم شتانەی وا لێرەدا دەیانووروژێنین، لەوێدا هەموویمان پێك هێنابوو. یەکە بە یەکەی هەڵەکانیانمان بۆ دەژماردن. ئەگەر گونجاو بوایە ڕێگەمان پێنیشان دەدان و، لە باری شارستانێتی و تێگەیشتوویی و بەڕێوەبەرێتییەوە ئامۆژگاریمان دەکردن. بەکورتی، دەتوانم بڵێم ئەوکاتە ئیتر لەمە تێگەیشتم کە من بە تەواوەتی لە باری بیرو بۆچوونەوە ناکۆکیم لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی "ئیتیحادو تەرەقی"دا هەیە. بۆ نموونە، ئەو پیاوانە دەیانویست کەسانی ناشیاو بە خۆیان و، تەنانەت ئەو کەسانەشەوە کە نەدەچوون بۆ پرسەو سەرەخۆشیەکانیان، پەرێشان بکەن و لەناوبەرن. خۆ لەڕاستیدا دواتر هەر وەهایان کرد. هەڵس و کەوت و تاوانێکی لەم جۆرە، بەگوێرەی ویژدان و ئاستی تێگەیشتنی من، بەرامبەر بە نەتەوەکانیش لەگەڵ ئەو کەسانەدا جیاوازی و ناکۆکیمان هەبوو. بەڵام ئەم جیاوازییە تا ئاستێك زانستی و، لە ئەندازەیەکیشدا سیاسی بوو. هەر بۆیە دەتوانرا پێکهاتن بهێنرێتە ئاراوە. بەڵام شادی و چێژی تاوان کەلەبەرێکی قووڵی لەنێوانماندا دروست کرد. وەك چۆن پێشتر ئاماژەم پێکرد، لەلایەکی ترەوە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی هەر لەوکاتەوەی کە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی گرتە دەست، بە شێوەیەکی ناڕەوا دەستی بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان کرد. دەیانویست، بە سوودوەرگرتن لەم هەلە، گیرفانەکانیان پڕ بکەن. ئەوکاتە یەکسەر تێگەیشتم ئەو هەموو

دەنگەدەنگ و بالادەستییە لەبەر ئەم شتەیەو، ئەوەش کارێکی خراپی کردە سەر من. کات، خۆبەخۆو بەپێی نەریتی خۆی، ڕاستیی ئەم خەفەت و ئازارەی سەلماند" بەتایبەت داروودەستەی "ئەحمەد ڕەزا"[10] و "ڕەحمی"[11] و "تەلعەت"[12] و "نازم"[13] و "بەها شاکیر"[14]

---

[10] ئەحمەد ڕەزا، سیاسەتمەدارێکی وڵاتی عوسمانی بووە. ساڵی ١٨٥٩ لە ئەستەنبووڵ لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٣٠ لە هەمان شاردا مردووە. ئەندامێکی سەناتۆی یەکەم (مەجلیسی ئەعیانی یەکەم) بووە، عەلی ڕەزای باوکی، لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەبوە، بە "عەلی بەگی ئینگلتەرەیی" ناوبانگی دەرکردووە. بە پەروەردەیەکی ڕۆژئاوایی گەورە بووە. دوای ئەوەی دوا قۆناغی خوێندنی خۆی لە قۆتابخانەی کۆتاییی (غەڵەتە سەرای) تەواو کردووە، بۆ خوێندنی بەشی کشتوکاڵ لە زانکۆ چووەتە ئەورووپا. لە گەڕانەوەدا، بووە بە بەڕێوەبەری بەشی زانستی لە (بورسە). دوای ماوەیەك وازی لەو کارە هێناوەو ڕووی کردوەتە پاریس و، هەر لەوێش بووە بە سەرۆکی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. ناوبراو، ڕۆژنامەی مەشرووتییەتی بە زمانی تورکی و فەرەنسی دەرکردووە. ساڵی ١٩٠٨ و دوای شۆڕش گەڕایەوە بۆ ئەستەنبووڵ، ئەرکی ڕاوێژکاری و ئەندامێتیی کۆمیتەی ناوەندیی وەرگرتووەو بووە بە نوێنەری خەڵك لە ئەستەنبووڵ. دوای ئەوەی سێ ساڵ سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکی بەدەستەوە بووە، بووە بە ئەندامی سەناتۆ (یاخود مەجلیسی ئەعیان).
بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ژیانی سیاسیی ئەحمەد ڕەزاوە، بڕوانە (بیرەوەرییەکانی محەمەد موورادی میزانچی) کە دەزگاکەمان بڵاوی دەکاتەوە.

[11] یەکێك بووە لە دامەزرێنەرو سەرکردەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، ساڵی ١٨٧٤ لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە. یەکێکیش بووە لە دامەزرێنەکانی "کۆمەڵەی ئازادی عوسمانی" کە ساڵی ١٩٠٦ لە سەلانیك دامەزرا. ماوەیەك نوێنەری شاری سەلانیك بووە. "ڕەحمی ئاسلان"، لە بە شێکی تری ژیانی سیاسیی خۆیدا، ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنی "کۆمەڵەی بەرەوخەڵك" بووە کە

بە شێوەیەك بەستراوەتەوە بە كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقیەوە. دواتر ئەویش بە دەستی كەسێكی ئەرمەنی لە بەرلین كوژراوە. ناوبراو، بە شۆڕشگێڕو ناودارێكی مەیدانی ڕێكخستن ناسراوەو، چەندین كتێبی جۆراوجۆری لەبارەی پیشەكەی خۆیەوە هەیە.

[۱۲] ساڵی ۱۸۷٤ لە (ئەدرنە) لەدایك بووەو، ساڵی ۱۹۲۱ لە بەرلین ژیانیی لەدەست داوە. سەركردەیەكی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و سیاسەتمەدارێكی عوسمانی بووە. قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی لە ئەدرنە تەواو كردووە. ماوەی دوو ساڵیش لە قوتابخانەكانی "ئالیانس" دەرسی خوێندووە. لە پۆلی دووهەمی كۆلێژی یاسای سەلانیك وازی لە خوێندن هێناوەو، لە تەلگرافخانەی سەلانیك دەستی بە كار كردووە. هەر دوای ئەوە، لەبەر كاروباری سیاسی، سێ ساڵ زیندانی كراوە. دوو ساڵ دوای ئەوەو پاش لێبوردن، لە پۆستەخانە بووە بە فەرمانبەر. دواتر كاتێك بووە بە سەركاتبی بەڕێوەبەرێتیی پۆستەو تەلگرافخانەی سەلانیك، لەبەر پەیوەندی و كاروباری خۆی، لە كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەركراوە. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەت، بووە بە نوێنەری شاری ئەدرنە. پاشتر ئەركی سەرۆكایەتیی پارلەمان و وەزیری ناوخۆو وەزیری پۆستەو تەلگراف وەرگرتووەو، دوای ئەوانەش بووە بە سەرۆك وەزیران (۱۹۱٦). پاش یەكەم شەڕی جیهانی، هەڕای كردووەو چووە بۆ ئەورووپا. ماوەیەك لەوەبەدوا لە بەرلین لەلایەن كەسێكی ئەرمەنییەوە كوژراوە.

[۱۳] ساڵی ۱۸۷۳ لە سەلانیك لەدایك بووەو، ساڵی ۱۹۲٦ لە (ئزمیر) كۆچی دوایی كردووە. گەورە بەرپرسێكی دوڵەتی عوسمانی و دامەزرێن و بەڕێوەبەرێكی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بووە. خوێندنی پزیشكیی خۆی لە پاریس تەواوكردووەو، هەر لەوێ لەگەڵ "ئەحمەد ڕەزا بەگ"دا پێكەوە كاریان كردووە. ڕۆڵێكی كاریگەری لە یەكخستنەوەی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە پاریس و "كۆمەڵەی ئازادی عوسمانی"دا لە سەلانیك گێڕاوە. بە ناسناوەكانی مامۆستا محەمەد ئەفەندی و یاقووب ئاغای توتونچییەوە، لە سەلانیك و ئزمیر كاری ڕێكخستنی نهێنیی ئەنجام داوە. دوای مەشرووتییەت بووە بە وەزیری زانست و پەروەردە. مانگی تشرینی

**بە شێوەیەکی ئاشکرا خان و فەرماندارانی پێشووی سەردەمی عەبدولحەمیدی دووەم و گەورەپیاوانی دەورانی سەرەڕۆیی و ملهوڕییان ڕووت دەکردەوەو، بەبێ ئەوەی تۆزێک پێوانەیان هەبێ و بیری دواڕۆژ بکەنەوە، هەموو ڕێگەو شێوازێکیان بۆ بەدەستهێنان و قازانجکردنی پارە تاقیکردەوەو، تەنانەت بەرۆکی تاکەکانیشیان دەگرت. منیش کاتێک بینیم کۆمەڵە ڕێگە بەم کارانەیان دەداو**

---

دووەمی ١٩١٨، لەگەڵ ئەنوەر پاشاو جەمال پاشاو تەلعەت پاشادا، ڕۆیشتە دەرەوەی وڵات. ساڵانی تێکۆشانی نەتەوەیی، لەگەڵ جەمال پاشادا، لە قەفقاسیا بوون. دوای ماوەیەک گەڕایەوە، بەڵام بە تاوانی پەیوەندیداریی بە هەوڵی تیرۆری "مستەفا کەمال"ەوە لە ئەزمیر، دەستگیرکراوەو لەسێدارە دراوە.

[١٤] ناوی تەواوی دکتۆر بەهادین شاکیرە، ساڵی ١٨٧٤ لە ئەستەنبووڵ لەدایک بووەو، لە ١٦ی نیسانی ١٩٢٢ دا لە بەرلین مردووە. سەرکردەو بەڕێوەبەرێکی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بووە. لە ئاکادیمیای پزیشکیی عەسکەری بە پلەی کاپتن دەرچووە (١٨٩٦). دواتر هەر لەوێ بووە بە یاریدەدەری مامۆستای پزیشکی دادوەری (١٩٠٠). ئەمجا بووە بە پزیشکی تایبەتی شازادە یووسف عیزەدین ئەفەندی.
دوای ماوەیەک لەگەڵ ئەحمەد ڕەزاو سەرکردەکانی تری "کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی"دا پەیوەندیی گرتووە. هەر لەبەر ئەمەش دوور خراوەتەوە بۆ ئەرزنجان و ترابزۆن. ساڵی ١٩٠٥ لە وڵات چووەتە دەرێ و هەڕای کردووە بۆ میسر،و دوابەدوای ئەوەش بۆ پاریس. پاش ماوەیەک بە شێوەی نهێنی گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و، ڕۆڵێکی کارای لە کاروباری ڕێکخستنی کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی"دا گێڕاوە. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووەم، ئەرکی ڕاپەڕاندنی کاروباری پزیشکیی پێ سپێردرایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بە شێوەیەکی بەردەوام ڕۆژنامەی "شوورای ئوممەت"ی دەردەکرد، کە پێشتر لە قاهیرەو پاریس دەردەچوون. لە ڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بەناوی کاروباری ڕێکخستنی تایبەتەوە لە ئەرزنجام و هەرێمی دەورووبەریدا کاری دەکرد. دوای شەڕ، وەکوو ئیتیحادچییەکانی تر ڕای کردە دەرەوەی وڵات (١٩١٨).

چاوپۆشـــییان لێدەكـــات، تووشـــی نائومێــدیو ســـاردبوونەوەیەكی لەرادەبەدەر بوومو، ئەم ساردبوونەوەو وازهێنانەشم لەوان نەشاردەوەو لێی نەكەوتمە شەرمەوە. بەم جۆرە جیاوازیی ڕەوشتیو ویژدانی، بە جیاوازیی بیرو بۆچوونەكانیشمانەوە، زیاتر بوو.

گەورەپیاوانی كۆمەڵە لەبنەڕەتدا، لەبەر ئەم دواین جیاوازیانەی مـن بوو، ئاوها ڕقو كینەیان لێهەڵگرتمو، زۆری پێنەچوو بەئاشكرا بوونـە دوژمـنم. هـەتا یاسـاكانی پێـشووشیان لەبەرچـاو نـەگرتو هـەموویان خستە ژێر پێو، بە نانكوێرییەكی ئاسـایـیـیـەوە دوژمنایـەتییان كـردم. دواتـر ئـەو دەسـتدرێژیانەی سـەر مـن كـە بـە شـتێكی ڕەوایـان لەقەڵـەم دەدا، لەگــەڵ درۆو تاوانباركردنەكانــدا، ئاســتی ئــەم دوژمنایەتیــەیان بەرامبەر بە من دەرخست. ئیدی من دەگەڕێمەوە بۆ لای ویژدانی خەڵك، بــا ئــەو بڕیــاردەر بــێ. ئایــا ڕووداوەكــان بــە شــێوەیەكی ئاشــكرا نەهاتوونەتە مەیدان ؟ هەق بەلای كام لایەنەوەیە ؟ كێ بێتاوانو پاكە ؟ كـێن ئەوانــەی بەڕاســتی بـیر لــە نیـشتمان دەكەنــەوە ؟ كـێن ئەوانــەی دەیانـەوێ بـە بـەهای خیانـەتكردن بـە نیشتمانو خیانـەتی تـر ویـستو ئارەزوەكـانی خۆیــان دەســتگیر بكــەن ؟ ئیــدی خۆتــان دەینــرخێننو، هـەموو ئەمانـە شـیدەكەنـەوە. ئێمـە خـۆیلـەخۆیـدا هـەر ئەوكاتـە لـەوە دڵنیابووین كە دادو هەقو ڕاستی بێتاوان دەردەچنو پاك دەبنەوە

## دۆڕانەكەی كامیل پاشا

کامیل پاشا[١٥] پیری مەیدانی سیاسەت لەلایەکەوە بە هەموو توانایی و هێزی خۆیەوە ڕێ و شوێن و تەگبیری گونجاوی بۆ مەترسییە سیاسییە دەرەکییەکان دادەنا و هەوڵی لەناوبردنیانی دەدا و لەوبارەیەوە بەبێ وچان درێژەی بە کارە خێردارەکانی خۆی دەدا. لەلایەکی ترەوە بە تێگەیشتنێکی قووڵەوە هەوڵی بۆ بەدیهێنانی ئارەزوو و خواستەکانی خۆی دەدا بۆ پتەوکردنی پێگەی مەشرووتییەت و ئاساییکردنەوەی بارودۆخی ئاڵۆزی وڵات و لەناوبردنی دوژمنایەتیە وێرانکەرەکان و، بە سەنگێکی کراوەوە خۆی ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئاستەنگێك دەبوو. دەیویست هەموو گەندەڵی و مامەڵەو هەڵس وکەوتە زانراوەکانی ڕابردوو و ئێستا و زۆرداری کۆمەڵە بۆ هەموان ئاشکرا

---

[١٥] ناوی "محەمەدی قوبرسی"یە، ساڵی ١٨٢٣ لە (لەفکۆشە) لەدایك بووەو، ساڵی ١٩١٢ هەر لەو شارە چاوی لێك ناوە. یەکێك بووە لە گەورە بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی. خوێندنی خۆی لە ئاکادیمیای عەسکەریی قوبرس و میسر تەواو کردووە. شارەزاییی لە زمانەکانی فارسی-عەرەبی-فەرەنسی-ئینگلیزی-ئیتالی هەبوە. کاتی خۆی کاری وەرگێڕان و کاتیبی بۆ عەباس پاشای پارێزگاری میسر کردووە.
ئەرکی بەڕێوەبەرێتیی ئەوقاف و کاروباری دینی و قایمقامی و پارێزگاریی قوبرسی وەرگرتووە. دواتر لە پۆستی وەزیری ئەوقاف و وەزیری زانست و پەروەردەدا کاری کردووەو، دوای ئەوانەش چوار جار بووە بە سەرۆك وەزیران (١٨٨٤،١٨٩٥،١٩٠٨،١٩١١). دوایین جار کە بوو بە سەرۆك وەزیران، ئیتیحادچییەکان پەلاماری بابی عالی (دەرباری عوسمانی)یان داو، ئەویش بەناچاری دەستی لەکار کێشایەوەو ڕۆیشتەوە بۆ لەفکۆشە. چەندین بەرهەمی بڵاوکراوەی هەیە کە بەم جۆرەیە: (مێژووی سیاسی/ سێ بەرگ، وەڵام بۆ سەعید پاشا،بیرەوەریەکان / بەرگی یەکەم).

بکاتو، بەتایبەت بەرنامەی دەستتێوەردانی سوپا لە کاروباری حکوومیدا پووچەڵ بکاتەوە.

جێی باسە، ئەندامانی کۆمەڵە هەمیشە کۆسپو تەگەرەیان لەبەردەم کارە ئازادیخوازانەکانی ئەو وەزیرە تێگەیشتوو و پیاوماقووڵەی مەیدانی سیاسەتدا دروست دەکرد.

بۆ ئەوەی ئەو کابینەیەی وا بە سەرۆکایەتی ئەو کاری دەکردو هەمان ئارەزوو و ئامانجی سەرەکیی هەبوو و بەدوایاندا بچوایە، پێویست بوو ئەو کەسانەی کە جێگە لە کابینەکەدا دەگرن، ئازاو نەترس بنو یەك بیرو بۆچوونیان هەبێو هاوئاهەنگیی کابینەکەیان پێك بهێنایە.

ئەو پیاوە بلیمەتە، پشتبەستوو بە یاسای بنەڕەتی، هەوڵی پراکتیزەکردنی ئەم ئارەزوەی دا. گۆڕانکاریی لە بەشەکانی وەزارەتی جەنگو وەزارەتی هێزی دەریاییدا کرد. بۆ پاراستنی ئازادیە پیرۆزەکانی گەلەکەمان، لەناو کابینەدا وەزیفەی دایە فەرماندەیەکی زیرەكو لێهاتوو و شەرەفمەندی "نازم پاشا"[١٦] ناوی سوپاکەمان.

---

[١٦] نازم پاشا، یەکێك بووە لە گەروە بەرپرسانی حکوومەتی عوسمانی. سالی لەدایکبوونی دیار نییە، بەلام سالی ١٩١٣ کۆچی دوایی کردووە. دوای ئەوەی لە ئاکادیمیای جەنگ بە سەرتیپی پارێزەر دەرچوو، ئەرکی جۆراوجۆری پێ سپێردرا. کاتێك بوو بە ژەنەراڵی گشتی، دوورخرایەوە. بەلام سالی ١٩٠٨ گەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی. دوای ماوەیەك، کامیل پاشا کردی بە وەزیری جەنگ. دوای لەسەرکارلابردنی کابینەکەی کامیل پاشا، بوو بە پارێزگاری بەغدا. بەلام دوای ماوەیەك دووبارە بووەوە بە وەزیری جەنگ. لەکاتی پەلامارە بەناوبانگەکەی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقیدا بۆ سەر (بابی عالی)، کوژرا.

"کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تـەرەقی" بـاش دەیزانـی وەرگێرانـی پۆسـتی چاودێری جەنگ لەلایەن نازم پاشاوە، گەڕانەوەی سەربازو سوپای بۆ سەر ئەرکە پیرۆزەکەی خۆی دەگەیاند. ئەمەش، بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ هیواو داخوازیی ئەو گرووپەدا نەدەگونجا. لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تەنیا ڕێگەچارە خستن و پاڵ پێوەنانی کامیل پاشایە، لەوبارەیەوە دەستیان بە پێشێلکردنی یاسـای بنـەڕەتی و پارچەپارچەکردنی مەشرووتییەت کرد.

دوا جار، هەڕەشەکردن و وتە خوێندنەوەی زۆر بە گوێی ئەم و ئەوداو زاڵبوونی هێزی چەکداری عەسکەری بەسەر (مەجلیسی مەبعووسان)[17] داو بلاوکردنەوە ترس لەنێو نوێنەراندا، سەرباری

---

[17] مەجلیسی مەبعووسان (هەیئەی مەبعووسان)، یەکەم ئەنجومەنی گشتیی نوێنەرانی خەڵك و باڵی هەڵبژێردراوی پارلەمانی کاتیی عوسمانییەکانە، کە لەگەڵ جێبەجێکردنی دەستووردا ساڵی ١٨٧٦، دامەزرا. ئەو باڵەی تری پارلەمان، هەیئەت یا مەجلیسی ئەعیان (یا سەناتۆ) بوو، کە پادشا دەست نیشانی کردبوون. هەر پەنجا هەزار کەس، بەپێی دەستووری بنچینەیی، دەیتوانی لەڕێگەی هەڵبژاردنی نهێنییەوە نوێنەرێك هەڵبژێرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ. ئەم پارلەمانە بۆ یەکەم جار، لە ٢٠ی مارتی ١٨٧٧ دا یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بەست و، ٢٨ی حوزەیرانی ١٨٧٧ پشووی وەرگرت. ئەو پارلەمانەی کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بۆ دووهەم جار هەڵبژێردرابوو، ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٧ دەستی بەکار کرد. بەڵام ماوەیەکی پێنەچوو فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم خرایە پشووەوە، هەر بە فەرمانی ئەو، لە چواردەی شوباتی ١٨٧٨ دا هەڵوەشێندرایەوە. ئەو پارلەمانەی کە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەت لە ساڵی ١٩٠٨دا، لەڕێگەی

دەیان گەمەو فێڵی جۆراوجۆر، بە شێوەیەکی ناڕەوا بوون بەهۆی بەدیهاتنی ویستو داخوازیەکانی ئەوان.

دوای ئەم چارەڕەشییە پڕ لە خەمو خەفەتەو لەم کاتە بەدواوە، ئەمجا نەهامەتی ڕووی کردە نیشتمانو مەشرووتییەتو، ساتەکانی پەرێشانیو بەدبەختی هاتنە پێشەوە. ئیتر دەرکەوتنی ئەم وەزعە پڕ دەردو ئازارە، بوو بە سەرەتای بێبەختیو کەوتنو دۆڕانمان لەبەردەم دنیای دەرەوەو ناوەوەدا. دوای دەست لەکارکێشانەوەی کامیل پاشا لە بەڕێوەبردنی حکوومەت، قۆناغی بەدبەختیو نەهامەتیی عوسمانی

---

هەڵبژاردنەوە دەستنیشان کرابوو، ١٧ی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەدا کرایەوە. ساڵی ١٩٠٩، ئەو پارلەمانە بە ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاری لە دەستووری بنچینەییدا، مافی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی خۆیو مافی پێشکەشکردنی پێشنیاری یاسایی بەبێ ئاگاداریو مۆڵەتی پادشا دا بە خۆی. لەلایەکی ترەوە، پارلەمان مافی (ڤیتۆ "Veto")ی لە پادشا سەندەوە. بەڵام پادشا بۆ ماوەی دوو مانگی ترو بە دانیشتنێکی تر ڕەوانەی پارلەمانی کردەوە. لە ئەنجامدا هەر ئەو یاسایە پەسندکراو، ئیتر ئەم شێوازە بوو بە باو، ئەگەر یاسایەك دووجار پەسند بکرایە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەخرایە مەیدانی جێبەجێکردنەوە.

ئەگەرچی پارلەمان دەسەڵاتی پادشای کەمتر دەکردەوە، بەڵام بۆ خۆی چووە ژێر ڕکێفی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. ئەم ماوەیە، تەنیا جارێك بنەمای بەرپرسیی سیاسیی پارلەمان بەجێهێنرا. لەلایەکی ترەوە، پارلەمان جارێك لە ١٩١٢ داو جارێکیش لە ١٩١٨ دا هەڵوەشێندرایەوە. دوای داگیرکرانی ئەستەنبووڵ، ئەنجومەنی نوێنەرنی خەڵك (پارلەمان) بۆ ماوەیەکی نادیار کەوتە پشووەوە. دواتر ساڵی ١٩٢٠و کاتی دامەزراندنی پارلەمانی گەورەی تورکیا (TBMM) لە ٢٣ی نیساندا، هەندێك ئەندامانی پارلەمانی پێشوو بەشداریی ئەم پارلەمانە تازەیان کرد.

دەستیپێکرد. بەداخەوە ئەم ڕووداوانە، بۆئەوەی هوشیارییەکمان تێدا بیووژێننەوە، زیانێکی گەورەیان لێدایین.

بە هاتنە سەرکاری "حوسەین حەلیم پاشا"[18]، گلەیی و سکاڵای گەلی عوسمانی ڕووی لە زیادبوون کردو، هەر ڕۆژە بەشێکی ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی، چونکە دوای هاتنە سەرکاری حکوومەتی تازە، کۆمەڵە دەستی بە زۆرداری و پاوانخوازی کردبوو. پێکهاتەکانی وڵاتی عوسمانی دووبارە گەڕانەوە ناو باوەشی پەرێشانی و بەدبەختیی جارانی خۆیان و، بەم جۆرە ئاسۆکانی ژیانی داهاتووی عوسمانی لەرێگەی ژاوەژاوو هەراو هوریای تۆمەت و درۆودەلەسەوە کۆتاییان پێهات. یەکێك لە بەڵگە ئاشکراو بەرچاوەکانی بێئیرادەیی

---

[18] حوسێن حیلمی پاشا، یەکێك بووە لە گەورە بەرپرسانی حکوومەتی عوسمانی. ساڵی ١٨٥٥ لە (شارلیجە/ میدیللی) لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٢١ لە ڤییەنا کۆچی دوایی کردووە.

دوای خوێندنی سەرەتایی، لەلای نامیق کەمالی بەڕێوەبەری شارەوانیی میدیللی بوو بە فەرمانبەر. دواتریش وەزیفەکانی بەڕێوەبەرێتیی نووسین، نامەنووسی، پارێزگاری، لێپرسراوی گشتی، وەزیری، باڵوێزی گەورەو سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرتووە. دوای لەسەرکارلابرانی کابینەکەی کامیل پاشا، بوو بە سەرۆك وەزیران (سەدری ئەعزەم)، بەڵام لە ڕووداوەکانی ٣١ی مارتدا ناچاری دەست لەکار کێشانەوە کرا. دوای ئەوەی سوپای پاکسازی ڕژایە ناو ئەستەنبووڵ، دووبارە کرایەوە بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. بەڵام ئەمجارەش زۆر نەمایەوەو، دوای یەکەم شەڕی جیهانی لە ڤییەنا مایەوە.

ئەوكاتـەمان، هـەمان ڕووداوەكـانی ٣١ی ئـادار[19] و كارەسـاتەكانی (ئەدەنە)[20] بوون.

## فیرقەی ئەحرار

یـەكێك لـە گـرنگترین فاكتـەرەكانی دەسـت لەكاركێشانەوەی كامیل پاشا لـە دەسـەڵاتو خێراتـر بـوونی داكـەوتنو دوڕانەكـەی، تێكـدرانی

---

[19] بۆ زانیاریی زیـاتر سـەبارەت بـەم ڕووداوە، سـەیری بەشـی ڕووداوەكـانی ٣١ی مارت بكەنو یادداشتەكانی ئەو بەشە بخوێننەوە.

[20] ئـەو شـەڕەیە كـە ڕۆژی هـەینی ١٤ی نیـسانی ١٩٠٩ لـەنێوان موسـڵمانو ئەرمەنیەكانـدا ڕووی دا. ئـەم ڕووداوە، بـە كـوژرانی دوو موسـڵمان لەلایـەن پارلـەمانتارە ئەرمەنیەكانـەوە دەسـتی پێكـردو، دواتـر بـوو بـە شـەڕی موسـڵمانو ئەرمەنی. سێ ڕۆژ دواتریش ڕووداوەكە كوژێنرایەوە. بەڵام ئەو ماوەیە زیـاتر لـە ٢٠ یان ٣٠ هەزار كەس كوژران كە زۆربەیان ئەرمەنی بوون. دوای ڕووداوەكـان (دیوانی جـەنگ) دامـەزراو، ئـەم دیوانـە (١٥) كەسـی بـە بەرپرسـی شـەڕەكە تاوانبـار كـردو بڕیـاری لەسێدارەدانی بـۆ دەركـردن. شـایانی باسـە، (٩) كەسـی ئەمانـە موسـڵمان بـوون. ئـەم دیوانـە شـەش كەسـی تریـشی تاونبـار كـردو، حـوكمی زینـدانیكردنی هەتاهەتایی بە مەرجی سەختو دژوارەوە بۆ بڕینەوە.

"فیرقەی ئەحرار"[٢١]ە لەلایەن مەشرووتییەتەکەی ئیتیحادو تەرەقی‌یەوە. جێی باسە، ئەم ڕێکخستنە لە بەشداریی ئەو کەسانەی کە ساڵانێکی دوورودرێژ لە دوورەوڵاتیدا مابوونەوە، لەگەڵ بەشداریی بەشێکی سیما لاوو ڕۆشنبیرو هەڵبژاردەکانی وڵاتدا پێك هاتبوو.

وەك چۆن کۆمەڵە دەستی بەسەر "فیرقە"دا گرتبوو، بە هیچ جۆرێك ڕێگە نەدەدا لە خۆیان زیاتر کەسی تر کۆنترۆڵی ئەو ڕێکخستنە بکات. لەکاتێکدا هەر کەس‌و تاکێکی ئەم وڵاتە مافی بیرکردنەوەی لە ئایندەو بەختیاریی کۆمەڵگەو هەوڵ‌و کۆششی لەو بارەیەوە هەبوو، کۆمەڵە،

---

[٢١] فیرقەی ئەحرار، بە فیرقەی ئەحراری عوسمانی ناسراوە. ئەم پارتە لە چوارچێوەی بۆچوونەکانی شازادە سەباحەدین بەگدا کاری دەکرد. ١٤ی ئەیلوولی ١٩٠٨، نوورەدین فەروخ‌و جەلالەدین عاریف دەستەی بەڕێوەبردنی پارتیان پێك دەهێناو، "ئەحمەد فازڵی‌و تەوفیقی قوبرسی‌و نازم بەگ‌و شەوکەت بەگ‌و ساهیر سەعید بەگ"یش ئەندامانی دەستەی دامەزرێن بوون. ساڵی ١٩٠٨ بەرامبەر بە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەشداریی لە هەڵبژاردنەکەدا کرد، بەڵام شکستی هێنا. دواتر لەبەر ئەوەی کەسانی وەکوو ئیسماعیل کەمال‌و زۆرابی کیرکۆرو دکتۆر ڕەزا نوور کەوتنە ناو پارلەمان، توانرا لە پارلەماندا نوێنەرایەتی فیرقەیش بکرێت.
ئەم دەستەیە، دژ بە ئیتیحادچییەکان، دەستی بە هاوکاری کرد لەگەڵ کۆمیتەی ئەرمەنییەکاندا. ڕۆژنامەکانی ئیقدام، سەباح، ڕۆژنامەی تازە، سەدای میللەت کە هەموویان لەسەر خەتی ئۆپۆزیسۆن بوون، بە شێوەیەکی سروشتی پشتگیریی "فیرقەی ئەحرار"یان دەکرد.
ئەم پارتە بە هیوایەکی گەورەوە پشتی ڕووداوەکانی ٣١ی مارتی گرت. بەڵام دوای خەفەکرانی ڕووداوەکان، بە تاوانبار لەقەڵەم دراو سزای هەمەجۆری وەکوو زیندانیکردن‌و دوورخستنەوە بەسەر ئەندامەکانیدا سەپێنراو، بەو جۆرە کۆتایی بە ژیانی سیاسیی "فیرقەی ئەحرار"یش هات.

بۆ ئەم مەسەلەیە، پەنای بردەوە بەر پاشکەوتوویی و میتۆدی ملهوڕیی جاران. لەکاتێکدا لە مەشرووتییەتدا، بە هەمان چەشنی حکوومەتە دەستوورییەکان، پارتە سیاسییەکان دەتوانن بە شێوەیەکی ڕێزدارانەو لەسایەی کونترۆڵی دەزگا نەتەوەییەکاندا درێژە بە بوونی خۆیان بدەن. نەویستنی حیزب، بە ئاشکرا واتای نەویستنی مەشرووتییەت دەدات. بە هەمان شێوەش (پاشکەوتوویی) دەگەیەنێ. نەویستنی حیزب، مانای وایە دەیانەوێ هیچ بەرپرسییەك نەخرێتە ئەستۆیان و، هیچ لێپرسینەوەیەکیشیان بەرامبەر بە کردەوەکانیان نەبێ. مەشرووتییەتیش ناتوانێ چاوپۆشی لەمانە بکات. لەم بارودۆخەدا، بەربەرەکانی و ململانێی ترسناك لەنێوان ڕاگەیاندنەکانی دنیادا پەیدا دەبوون و، دوابەدوای ئەوەش، ڕەوتی تازە دەهاتنە ئاراوەو، گلەیی و سکاڵاکانیش ڕوویان لە زیادبوون دەکرد. بەڵام ڕاگەیاندنی لای ئێمە لەنێو قەیرانێکی سەیری ئازادیدا بوو.

کۆمەڵە هەر لەزووەوە شتێکی کردبوو بە خوو و نەریتی خۆی، ئەوەش ئەوەبوو کە هەمیشە دەیگوت ((بەرنامەو پرۆگرامی من زۆر فراوانەو هەمووشتێك دەگرێتەوە)). بەم جۆرە بوونی هەر پارتێکی تری (چی دەبێ با ببێ) بە پێویست نەدەزانی و، بەپێچەوانەوە بە شتێکی پڕ لە زەرەری لەقەڵەم دەدا. بە واتایەکی تر، خۆی بە کۆنەپارێز، لیبراڵ، ڕادیکاڵ، دیموکرات، سۆسیالیست و، بەکورتی، خۆی بە هەمووشتێك دەزانی. کاتێك لافوگەزافی کۆمەڵە وەها بێ، بە شێوەیەکی سروشتی، لەناوبردنی ئەو پارتەشی دەکرد بە ئامانج و مەبەستی خۆی. لە هیچ جێگەیەکی تری ئەم

دنیایـەدا کۆمیدیایـەکی وەهـا بەرچـاو ناکـەوێ، بـەڵکوو ئەمـە دیاردەیـەکی تایبەت بە کۆمەڵگەی ئێمەیە.

بـەم پێیـە، کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تـەرەقی لـەژێر پـەردەی ئـەم جـۆرە هۆیانـەدا، بـە رێگـەی تۆمـەتبارکردن و بـە شـێوەیەکی پـڕ لـە کینـەو تـووڕەیی، "کۆمەڵـەی فیداکارانی میللـەت"[22]ی لێك هەڵوەشـاندەوەو، لەم ڕووەوە بە تایبەتی پێشێکارییەکی زۆری دەرهەق بە سـەربەخۆیی دادو یاسا کرد.

لـە "مەشـرووتییەت"[23]دا بـە بەڵـگەوە باسـی ئـەوەمان کردبـوو کـە تەلعەت بـەگ و کەسـانی تـر بـە چ پێوانـەو ئاستێك بەشـداری ئـەم کـارە

---

[22] ئـەو کەسـانەی وا لـە سـەردەمی سـوڵتان عەبدولحەمیـددا ڕایـان کـردە دەرەوەی وڵات، لەکاتی گەڕانەوەیاندا ساڵی ١٩٠٨ ئەم ڕێکخراوەیان دامەزراند. سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە "عەونوڵڵا ئەلکازم" بوو و بەڕێوەبردن و دەستەی دامەزرێنەکەشـی ئەسـەد بـەگ عـەلی وەفـا و دکتـۆر عـەلی سـائیب و عەبـدولقادری قـادری و حـاجی جـەمال و بەهجەتی ئاسیتانەلی ی ئەمینـداری سـندووق و ئەرتوغرول شاکیر بوون. ١٢ی ئابی ١٩٠٨ ئەم ڕێکخراوە بۆ یاریدەدان و وەرگرتنەوەی ماف ئەو کەسـانەی کـە سـەردەمی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووهـەم لەبـەر کاروبـاری سیاسـی بەناچاری ڕایـانکردبوە دەرەوەی وڵات، کۆبوونەوەیـەکی لـە (مەیـدانی سـوڵتان ئەحمـەد) سـازکرد. لەڕێگـەی ڕۆژنامـەی "حقووقی عموومییـە"شـەوە کـە ئۆرگـانی خـۆی بـوو، بۆچوونەکان خـۆی بڵاودەکردەوەو، چووە ڕیزی ئۆپۆزیسیۆنی دژ بە بەڕێوەبەرێتی ی ئیتیحادو تەرەقی. بەڵام دوای ڕووداوەکانی ٣١ی مارت، ئەوانیش لە مەیدانی سیاسی دەرکران.

[23] مەشـرووتییەت، مانگنامەیـەك بـوو شـەریف پاشـا، نێـوان تـشرینی یەکـەمی ١٩٠٩ – نیسانی ١٩١٤، بـە زمـانی تـورکی- فەرەنـسی لـە پـاریس دەری دەکرد. بـوو بـە زمانی حـاڵی بۆچوونەکانی شـەریف پاشـا و پارتی ڕیفـۆرمی بنچینەیی ی عوسمانی و نـەیارانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. دوای ئەوەی ئەم بڵاوکراوەیـە ڕەخنـەی لـە حکوومـەتی فەرەنسا گرت، کە

چەپەڵەو دەیان کاری ناھەقی تریان بوون و خۆیانیان پێ سووک کردووە. "فیرقەی ئەحرار"یش، لە یەکەم ھەلی گونجاودا، دەست نیشان کرا بۆ ئەم چارەنووسی لەناوچوونە، چونکە ئیتر مەشرووتییەت تەنیا بە قسە مابوو، ئازادییەکی سنوورداریش لەئارادا بوو.

فیرقەی ئەحرار، میوانداری و ئاھەنگێکی بەبۆنەی ڕۆژی سەربەخۆیی عوسمانییەوە ڕێک خست. ئەوکاتە پۆستی سەرۆک وەزیران بەدەست کامیل پاشاوە بوو. فیرقەی ئەحرار بەشێوەیەکی ئاسایی گەورەپیاوانی دەوڵەت و بەرپرسە حکومیەکانیشی بانگی ئەم میوانداریيە کرد. کامیل پاشاش، وەک سەمبولی شەرەف و ڕێزی نەتەوەیی و دەوڵەتی عوسمانی، ئامادەی ئەم میوانداریيە بوو.

ھەر لەوساتەش بەدواوە، کامیل پاشا مەحکوومی لەناوچوون و دۆڕان کرابوو. قارەمانە گەورەکان (!)، بە ھەموو ناسناوە پیرۆز پڕ لە ڕێزو شکۆکانی خۆیانەوە، بۆ سەپاندنی ئیرادەو داخوازیەکانیان، ھەموو ھێزی شاراوەی "کۆمەڵەی ئیتیحاد"یان لەپێناوی فێڵ و گەمەکانی خۆیاندا خستەگەڕ. دوای ئەمە بوو کە ھەندێک سەربازو ئەفسەری سوپا ھۆڵەکانی (مەجلیسی مەبعووسان)یان خستە ناو چەمبەرەوەو، دەستیان بە گەشت و پاسەوانی کرد لە دەوروبەری (بابی عالی). کە چاومان بەم بارودۆخانە کەوت و تەماشای ئەم کەوتن و دۆڕانەمان کرد، ئیدی ھیوایەکمان بە مەشرووتییەت و ئایندە نەما.

---

قەرزێکی ٨٠٠ ملیۆن فرانکیی داوە بە ئیدارەی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و، پێداگریی لەسەر ئەوە کرد کە بوونی ئۆپۆزیسیۆن لەم وڵاتەدا مانای نەماوە، ڕێ لە چاپ و بڵاوکرانەوەی گیراو قەدەغەکرا. شەریف پاشا خۆی، لە لاپەڕەکانی تردا، لە کاردانەوەی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەرامبەر بەم بڵاوکراوەیە دەدوێ.

مەترسی، بە هەموو ئاسۆرییەکی خۆیەوەو بە شێوەیەکی ئاشکرا، خۆی نیشان دەدا. ئەمانە هەموو لە ئاستێکدا بوون، کە ئێمە بە داخ و خەفەتەوە وەکوو قۆناغی ڕابردوو بیرمان لە توانەوەو لەناوچوونی خۆمان دەکردەوە. ئەم پاشاگەردانییە بوو بەهۆی پەیدابوونی بەڕێوەبەرێتییەکی بێبڕیارو هەوڵ و تەقەلای سەیرو سەمەرە. حکوومەت، بە شێوەیەکی ئاسایی چەمکی میانڕەوی و ڕێوشوێن دانانی فەرامۆش کردبوو و، بەرامبەر بە بەرژەوەندی دەستە شاراوەکان و داخوازییە چاوەڕوانکراوەکان شکستی هێنا. بە بۆچوونێکی پڕ لە تاوو تینەوە سەرمان خستە نێوان هەردوو دەستمان و زۆر بە باشی بیرمان کردەوە، وەکوو خەڵك و حکوومەت بیرمان لە بێبەختی ی خۆمان کردەوەو خەفەتمان بۆ خوارد. دواتر دەنگی ویژدان و دەروونمان ئەرکەکانمانی بیر هێنایەنەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بەڕاستی و بە نەرمییەکەوە داوانامەیەکی دەست لەکارکێشانەوەمان بۆ کۆمەڵە بەرزکردەوە. لەونامەیەشدا، وەکوو جاران، ئاگادارکردنەوەکانی خۆمانمان بە شێوەیەکی ئاشکراو نەرم دووبارە کردەوە. ڕۆژی دوای ئەوەی کە بە دڵگرانی و خەفەت و ئازارەوە وڵاتەکەمان بەجێهێشت، داوانامەی دەست لەکارکێشانەوەکەیان بۆ بڵاوکردینەوە. دوای ئەوە، ڕووداوەکان ئەوەیان پیشاندایـن کە وازهێنانەکەمان کارێکی لەجێی خۆدا بووە.

لەبەر ئەمەش، لەلایەکەوە لەبەر وەزعی نالەبارو قەیراناوی ی وڵات و ئازارەکانی لە دڵەراوکێ و پەشۆکاندام و، لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی بەشداری ی ئەم جۆرە تاوانانەم نەکردووە، زۆر ئاسوودەو بێخەمم کە بڵاوکردنەوەی داوانامەی وازهێنان و دەست لەکارکێشانەوەم وەك خۆی لەم کتێبەدا بە شتێکی گونجاو دەزانم.

ئەمـەی خـوارەوە دەقـی داوانامـەی دەسـت لەکارکێـشانەوەمە کـە بەڵگەی جودابوونەوەمە لە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی‌یەو، ١٠ی ئاداری ١٩٠٩ لە ژمارە (٣٢٥)ی ڕۆژنامەی "ئیقدام"[٢٤] دا بڵاوکراوەتەوە:

((بۆ بەڕێز دەستەی بەڕێوەبەرێتیی کلووبی پانگاڵتی،

سەرەتا دەمەوێ سەبارەت بە چاکەو بایەخدانی هاوڕێیان بە خۆم، ڕێـزو سوپاسـم ئاڕاسـتەی هەموولایـەکتان بکـەم، ڕای‌بگەیـەنم هـیچ کاتێـك ئـەو دۆسـتایەتی و خۆشـبینی و گرنگـی پێدانـەی هاوڕێیـانی کلـووب کـە هـەردەم بەرامبـەر بـە مـن نواندوویانـە، لـەیادم ناچـنەوەو فەرامۆشـیان ناکـەم، لەبەرچـاوگرتنی ئەوانـەش بـە قـەرزی ملـی خـۆم دەزانم. ئەمڕۆ کاتێك بەناچاری لە هەموو دۆسـتانو هاوڕێیانی نـاو ئـەم دەسـتەیە جودادەبمـەوە کـە بەشـانازییەوە پەیوەنـدی دۆسـتانەم لەگـەڵ هەموویانـدا هـەبوەو شـەیدای ڕەوشـتبـەرزیو تایبەتمەنـدیی نایـابی ئەوان بووم، یەکێك لە پڕئازارترین ڕۆژەکانی تەمـەنم بەسـەردەبەم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ ئەو هێزەی وا ئێمـەی هـان دەداو بـەڕێوەی دەبـردین (سـەرەڕای ئـەوەی کـە سـەرەتا بـە شانوشـکۆی بـەختیاریی وڵاتو نیـشتمان ڕازێنـدرابوەوە)، بـەناوی ئاینـدەی نەتـەوەو نیـشتمانەوە بـە لاڕێیـەکی زۆر مەترسـیداردا ڕۆیـشتووەو، وای لـێهـاتـووە هـەموو

---

[٢٤] ڕۆژنامەیـەکی نەتـەوەیـیی ڕۆژئـاواخواز بوو، لـە ٥ی تـەمووزی١٨٩٤ تـا ٣١ی کـانوونی یەکـەمی ١٩٢٨ دەردەچـوو. سەرنووسـەرو دامەزرێنەکـەی "ئەحمـەد جـەودەت" بـوو. نووسـەرە بەناوبانگـەکانی: ئەحمـەد میدحـەت، حوسـێن ڕەحمـی، ئەحمەد ڕەحیم، خالید زیا، ئەحمەد حیکمەت، حەمدوڵڵا سوبحیو ئەحمـەد ڕیفقی بوون. ئەم ڕۆژنامەیە پشتگیری تێکۆشانی نەتـەوەیی بوو و پێشکەوتنێکی باشـی لەڕووی کولتوور و هونەر بیرو بۆچوونەوە هێنایە ئاراوە.

دۆستان و ولاتپاریزان خەریکی بیرکردنەوەیەك بکات. لەبەر ئەوەی نامەویٔ بەرپرسی ئەو ئەنجامە بم، هەرچەندە بەرپرسیەکەشم کەم بێ، کە لە داهاتوودا دوای یاریکردن بە چارەنووسی گەلێك دێتەئاراوە، ناچاری دوورەپەرێز مانەوەو بەشداری‌نەکردن لەم شتانە بووم.

هەرچەندە بە سوێندخواردن پەیمانی بەردەوامیی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ ئەم هێزەدا دابوو، بەلام لە هەمان کاتدا، لەپاڵ ئەم سوێندخواردنەدا، پێویست بوو بەر لە هەمووشتێك پەیوەندییەکی ویژدانیی دەروونی بێتەئاراوەو، دەبوو بەپێی پیشەی خۆمان، یانی بەگوێرەی نیشتمانپەروەری‌و ئازادیخوازیی خۆمان، پابەندبوونە پاکەکەی جارانی خۆمان بەرامبەر بە کۆمەڵە بگوێزینەوە بۆ پابەندبوون بە بنەماکانی مەشرووتییەت. بەلام ئێستا لەبەر ئەوەی لادان لە ئەم بنەمایانە گوێزراوەتەوە بۆ لادانێکی ویژدانی، ئیدی ڕەوایی‌ی سوێندەکەشمان هەڵدەگیری‌و ناوەڕۆکەکەی پووچەڵدەکرێتەوە پابەندبوونمان پێویستیی بەوە نییە[٢٥].

بەگوێرەی ئەمە، ئەو بارودۆخەی کە بۆ وازهێنان‌و خۆکێشانەوە لە کۆمەڵە من دەخاتە ناو داوی ناچارییەکی مەعنەوییەوە، بە مەرجی مانەوەی پابەندبوون‌و بەسترانەوەم، جودابوونەوەشم لەم دەستە بەرێزانە وەك پێویستییەك دەخاتە پێشەوە. بەلام لەبەر ئەوەی ئەم هەڵس‌وکەوتە تەنیا لە بیری بەختیاری‌و سەلامەتیی نیشتمان‌و

---

[٢٥] هەر ئەندامێکی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لەکاتێکدا هەر ئەندام بوایە، دەبوو سوێندی بەجێهێنانی هەرجۆرە فەرمان‌و ڕێنوێنییەکی بخواردایە. شەریف پاشا لە جێگایەکی تردا باسی ئەم سوێندە دەکات.

بەرەنگاریی هەرجۆرە سەرنج و بۆچوونێکی ترەوە هاتووەتە مەیدان و، ئەنجامی بیرو بۆچوون و بەخۆداچوونەوەکانی خۆشمە، هیوام وایە هاوڕێیانی بەڕێزم بەچاوی لێبووردەییەوە بڕواننە ئەم کردەوەیەم.

سەبارەت بەو قسەو باسانەش کە لەبارەی پەیوەندی منەوە بە "فیرقەی ئەحرار" دەکرێن و، هەندێکیشیان گەیشتوونەتەوە بە خۆم، دەمەوێ ئەوەتان پێڕابگەیەنم کە هەمووی درۆو دەلەسەی هەڵبەستراوەو هیچ بنەمایەکی ڕاست نییەو، ئێستاش بە تەمای پەیوەندیکردن بە هیچ گرووپ و دەستەیەکی ترەوە نیم. شایانی وتنە، هۆی ئەم شتانە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ پلەوپایەی پیرۆزی سەربازی ئێمە.

بەپێی بیروڕای خۆم کە لە ڕووداوە مێژووییەکانەوە بۆم دەرکەوتووە، بەشداریی چینی سەرباز لە کاروباری سیاسیی حکوومەتدا شتێکی زۆر مەترسیدارە. باروودۆخی ئێستای ئێمە، نموونەیەکی بەرچاوی ئەمەیە.

لەڕاستیدا هەوڵ و کۆششی نیشتمانپەروەرانەی سوپا لەسەرەتادا بۆ بەدیهاتنی ئازادییەکان، شتێکی ئاشکرایەو شایستەی ڕەتکردنەوە نییە.

بێگومان دوای دامەزراندنی مەجلیسی مەبعووسان، دەستێوەردانی دووبارەی سوپا لە کاروباری سیاسیی حکوومەتدا زەبرێکی گەورە بە یەکێتی و یەکریزیی سوپاو سەربازەکان وەشاند. جێی باسە، ڕۆڵی ڕێنیشاندەرانەو پێشڕەوانەی سوپا لە هەموو کاروبارێکی بەڕێوەبردنی مەشرووتییەتدا، ڕێگەی لەبەردەم سەرهەڵدانی بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکان و پەرەسەندنی ناڕەزایەتی کردەوە، کە

سەلماندن و نیشاندانی ئەنجامە خراپ و نالەبارەکانی شتێکی بەڵگەنەویست و کراوەیە.

لەبەر ئەمەش دەمەوێ ئەوەش ڕابگەیەنم کە بەردەوامی ی متمانەو بایەخدانی دەستەی بەڕێزی کلووبی پانگاڵتی بە من، شتێکی گرنگ و دڵخۆشکەرانەیە.

هاوڕێیانی خۆشەویست و ئەفەندی، لەگەڵ ئەوەی کە داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، هیوام وایە ئەم لاپەڕەیەش وەکوو نامەی ماڵئاوایی ی من پەسند بکەن".

ای ڕەبیعول ئەووەلی ١٣٢٨

بەرامبەر بە ١٠ی ئاداری ١٩٠٩

فەریقی یەکەم—شەریف.

# بانكی نەتەوەیی توركیا

سەرەڕای دەوڵەمەندیی سروشتی وڵاتەكەمان، لە باری سەرمایەو سامانەوە دەست كورت‌و هەژارین. لە بارودۆخێكی ئابووریی خراپ‌و سەرەتاییدا ژیان بەسەر دەبەین. سەدان ساڵ بەر لە ئێستا، ئەو كاتانەی خۆمان سەرقاڵی داگیركردن دەبووین، بە سایەی ئەوەوە لە پێكدادانێكدا، بە شێوەیەكی كاتی، بەرز دەبووینەوەو وەزعمان باشتر دەبوو. هەندێك جاریش، لەبەر بێ‌ئیرادەیی‌ی خۆمان، بە ناچاری‌و توورەییەوە دەسكەوتەكانی سەركەوتنمان دەگەڕاندەوە بۆ لایەنی بەرامبەر. هەتا ئێستا بووین بە تەماشاكەری ئەو ئەنجامە پڕ لە شەرمەزاریانەو، هەر وەها ماینەوە.

هێشتا لەسەر ڕێگە پڕ لە خەم‌و ئازارەكەمان بەردەوامین. وازمان لەو شتانە هێنا كە لە دەستمان دەرچوون، بەڵام ئایا دەتوانین ئەمانەی بەردەستمان بپارێزین یان نا ؟ لەڕاستیدا ئەمە شتێكی نادیارە، یا بە شێوەیەكی ڕاستتر، دەتوانین بڵێین كە گومانی لەسەرە. كاتێك هەبوو ئێمە لەڕووی دەرەوە زاخاومان دەردەدا، لەكاتێكدا لە ڕێگەی سەركەوتنی سەیرسەیرەوە وڵاتی هەمەجۆرمان داگیر دەكرد، نەماندەزانی بە چ شێوەیەك جێگەكانی ژێر دەسەڵاتی خۆمان بەڕێوە ببەین. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەمارگرژیمان بە نەزانیەكەی خۆمان زیاتر كرد. لەبەر ئەمەش لەڕووی بەڕێوەبەرێتییەوە تاریكایی‌و زوڵم‌و

زۆرمان بۆ خۆمان هەڵبژاردو، لە باری ئابووریشەوە هیچ شتێکمان ئەنجام نەدا. لایەنی پڕ لە خەمو ئازار ئەوەیە کە لەباتی ئەوەی پەرە بە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە بدەین، نەزانیە زۆر و هەمەگیرەکەی خۆمان بەرەو وێرانکاری و ڕووخان و تێداچوونی بردووین. بەداخەوە ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن کە ئێمە لە چەند سەد ساڵ بەر لە ئێستاوە بە شێوەیەکی بێئاگا لە لایەنی ئابووری و چۆنیەتی بەدەستهاتنی قازانج و سوودو چێژی بازرگانی، ژیانمان بردوەتە سەر.

ئێمە وامانـدەزانی دوای مەشـرووتییەت، بـە ڕەچـاوکردنی ئـەم بەرژەوەندیانـە، ئیـدی بـچووك و گـەورەو هـەموومان كـار بـۆ بەرزبوونـەوەو بـەدیهاتنی ئامانجـە ئابووریـەكان دەكـەین، بەتایبـەت دەسـتپێكرانـی هـەر كارێكی ئـابووری كـە بمانزانیایـە بەڕاسـتی بەكـەڵك و مایەی قازانجـە، لـەلای ئێمـە بـە گـرنگترین و پیرۆزتـرین ئـەرك لەقەڵـەم دەدرا. لەبـەر ئـەوەش بـوو لەپێشدا بە هەموومانـەوە هـەوڵی دامەزرانـدنی بـانكێكی نەتـەوەییمان دا. ئەم (بـانكی نەتــەوەیـی‌یـە) كـە دوژمنـان لەبـەر هانـدان و ورووژانـدن هەمیـشە چاوپۆشـییان لـێ دەكـردو بایـەخیان پێنـەدەدا، بـە ڕەنـج و تەقـەلای ئێمـە دامەزرا. ئێستاش دوژمنە ناسراوەكانمان ئەمە ڕەت دەكەنەوە.

ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەنبووڵ، بۆ دامەزرانـدنی بـانكێكی نەتـەوەیی، دەستمان بە گفتوگۆ كرد لەگـەڵ هاوڕێیانـدا و بەرنامـەو پرۆگرامێكمـان دانـا و، دوابـەدوای ئـەوە بـە مەبەسـتی چـوونە لەنـدەن ئەسـتەنبووڵم بەجێهێشت. لـەبارەی مەسـەلەی بانكی نەتـەوەیـی‌یـەوە، لەگـەڵ "لـۆرد هاردیـك"ی ڕاوێـژكاری پێـشووی جێگـری بـاڵیۆزی ئینگلتــەرە لــە ئەستەنبووڵ و نوێنەری پادشای تازەی هیندستاندا قسەم كرد.

کاتی حکوومەتی پێشوو، دەوڵەتی ئینگلتەرە پەیوەندییەکی بازرگانیی لە ئاستی ٤٠٪ی بودجەی حکوومەتدا بەرقەرار کردبوو. بەڵام بە هەر شێوەیەك دەبێ با ببێ، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییەکی ئابووریی پتەو لەنێوان هەردوو حکوومەتدا نەبوو. ئەمەش تەنیا لەبەر پێویستیی کات نەدەهاتە ئاراوە. ئەمڕۆ لە دنیای سیاسەتو شارستانێتیدا، دروستکردنی پەیوەندیی دۆستانەی بەهێز لەگەڵ هەر حکوومەتێکدا، لەڕێگەی پەیوەندییە ئابوورییەکانەوە دێتە مەیدان. لەبەر ئەمە بوو کە پێشبینیی دروستبوونی پەیوەندیی پتەوی دۆستانەی نێوان حکوومەتی گەورەی ئینگلتەرەو دەوڵەتی عوسمانی دەکراو، حکوومەتی ئینگلتەرە بە شێوەیەکی تایبەت بەڵێنی هاوکاریی لەسەر ئەم مەسەلە گرنگە دابوو. "لۆرد هاردیك" منی ڕەوانەی لای "سێر ئەرنەست کاسەل" کرد بۆ مەسەلەی ڕێکخراوی ئابووریی بانکی نەتەوەیی. لەگەڵ ئەمەشدا سێر ئەرنەست کاسەل لایەنگری دواخستنو درەنگکەوتنی بابەتەکە بوو. دوای ئەوەی لەگەڵ "سێر ئەرنست کاسەل"دا بە چڕوپڕی گفتوگۆمان لەسەر بابەتەکە کردو، تەنانەت دوای ئەوەی سەرلەنوێ بەرنامەکەمان داڕشتەوە، من گەڕامەوە بۆ ئەستەنبووڵ.

کاتێ گەڕامەوە بۆ ئەستەنبووڵ، سەردانێکی "کامیل پاشا"ی سەرۆك وەزیرانو تەوفیق پاشای[٢٦] وەزیری کاری دەرەوەم کردو لەوە

---

[٢٦] ئەحمەد تەوفیق پاشا ساڵی ١٨٤٥ لە ئەستەنبووڵ لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٣٦ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە. خەڵکی (کرم Krim)ـەو یەکێکە لە بەرپرسانی حکوومەتی عوسمانی کە کاری وەزارەتەکانو پۆستی سەرۆکایەتیی

دووام کە حکوومەتی ئینگلتەرەو، بەتایبەت سێر ئەرنەست کاسەل، دامەزراندنی ئەم دەزگا نەتەوەییە بە شتێکی جێگەی ڕێزو شانازی لەقەڵەم دەدەن. هەروەها ئەوەشم پێ زیادکرد کە ئەگەر لەڕێگەی تەلگرافێکەوە سەبارەت بەم بابەتە بانگی خودی سێر ئەرنەست کاسەل بکرێت و ڕێز سوپاسی خۆمانی پێڕابگەیەنین، ئەوا زۆر باش دەبێ. دوای هەفتەیەك تەلگرافەکە گەیشتە سێر ئەرنەست کاسەل. وەك چۆن "سێر ئەرنەست کاسەل"م بە نوێنەرانی گەورەو بەرپرسانی حکوومی ناساندبوو، سەرکل دۆریان "Sercl Doryan -Cercled orient"یشم لە چەند میوانداریدا بە گەورەپیاوانی حیزبی "کۆمەڵە"و بەرپرسانی حکوومی ناساند. شایانی باسە، جاوید بەگی[٢٧] وەزیری پێشووی داراییش، لەم میوانداریانەدا بەشدار بوو.

---

ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرتووە. ناوبراو نەوەی "میرزا مستەفای باخچەسەرایی"و کوڕی "فەریق ئیسماعیل حەقی پاشا"ی فەرماندەی توونەو هەرێمی دەورووبەری بووەو، ئاکادیمیای جەنگی تەواوکرد.

بەڵام دوای ماوەیەك وازی لە کاروباری عەسکەری هێناو، خۆی بۆ کاروباری دەرەوە گواستەوە. دوای ئەوەی ئەرکی جۆراوجۆری لە نوێنەرایەتیەکانی دەرەوەدا بەجێهێنا، بوو بە وەزیری کاروباری دەرەوە. بۆ جاری یەکەم، لەکاتی ڕووداوەکانی ٣١ی مارتدا، بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. بەڵام کاتێك سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لەسەر تەختی دەسەڵات لابرا، دەستی لەکار کێشایەوە. دوای چەند ئەرکێکی جۆراوجۆر، ساڵی ١٩١٨ بۆ جاری دووەمو ساڵی ١٩٢٠ بۆ جاری سێیەم بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. تەوفیق پاشا دوای مردن لە مەزاری یەحیا ئەفەندی لە (بەشکتاش) نێژرا. ناوبراو بە یەکێك لە دروستترین و بەناموسترین بەرپرسانی حکوومەتی دوای مەشرووتییەت دەناسرا.

[٢٧] جاوید بەگ، ناوی ڕاستی محەمەدەو ساڵی ١٨٧٥ لە سەلانیك لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٢٦ لە ئەنقەرە ژیانی لەدەست داوە. سیاسەتمەدارو بەرپرسێکی

دەبوو، بۆ چارەسەرکردنی هەندێك کێشە، سەرێکی میسرم بدایە. بە هەڵکەوت لە سەفەرەکەمدا "سێر ئەرنەست کاسەل"یش بوو بە هاوسەفەرم. ئەوکاتەی ئێمە لە میسر بووین، حکوومەتەکەی حەزرەتی کامیل پاشا لەسەر کار لابرابوو.

هەر کە گەڕامەوە بۆ ناوخاکی وڵاتەکەی خۆم، سێر ئەرنەست کاسەل لە (ئەسوان)ەوە بەڕێگەی تەلەگراف دلوای زانیاریی سەبارەت بەم بابەتە کرد. کاتێك لە قاهیرە یەکتریمان بینی، باسی ئەوەم بۆ کرد کە کامیل پاشا بە گەمەو فێڵی کۆمەڵە لەسەر کار لابراوەو، ئەمەش بۆ داهاتوو و، بەتایبەت بۆ مەشرووتییەت خۆی شتێکی زۆر مەترسیدارە. هەروەها دڵگرانیی خۆم سەبارەت بەوەی کە لەبەر ئەم ڕووداوە ناتوانم لە مەسەلەی دەزگای نەتەوەیی (بانکی نەتەوەیی)دا کاری لەگەڵدا بکەم، دەربڕی.

کاتێك، بە مەبەستی لێوردبوونەوەی زیاتر لە بابەتەکە، لەگەڵ "سێر ئەرنەست کاسەل"دا گەڕاینەوە بۆ ئەستەنبووڵ، چاوم پێکەوت بە کەوتنی حکوومەتی کامیل پاشا هەوساری دەسەڵات بەتەواوەتی کەوتوەتە دەستی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، بە شێوەیەکی گشتی لە ئەنجامەکانی ئەمە ترسامو، وەکوو ئەنجام باسی ئەوەم کرد کە لەم هەلومەرجەدا پێداگری

---

حکوومەتی عوسمانی بوو. بە شێوازی جۆراجۆر کاری فەرمانبەریو مامۆستایی کردووە. وردەوردە بووە بە یەکێك لە نوێنەرە ناسراوەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. دوای مەشرووتییەت بوو بە نوێنەری سەلانیكو، دواتر بە وەزیری دارایی. لەبەر کێشمەکێشو ئاژاوەی ناو حیزب، بەناچاری وازی لە ئەرکو نوێنەرایەتیی پارلەمان هێناو، تەنانەت بەناچاری ڕۆیشتە دەرەوەی ولاتیش. دواتر هەموو پۆستەکانو پۆستی تریشی پێ سپێردرایەوە. دوای کۆمار، لەبەر ئەوەی گومانی لێ دەکرا پەیوەندیی بە ڕووداوی تیرۆری مستەفا کەمالەوە هەبێ لە ئزمیر، لە ئەنقەرە ئیعدام کرا.

لەسەر دامەزراندنی دەزگای ئابووری ناکەم، بەڵام ئەوی لەدەستم بێ بۆ پێکهێنانی ئەو دەزگایە، درێغی ناکەم.

"کامیل پاشا"، دوای دەست کێشانەوە لە پۆستی سەرۆك وەزیران، ئێوارەیەك من و سێر ئەرنەست کاسەلی کردە میوانی خۆی. کامیل پاشا لەم میواندارییەدا، سەبارەت بە دامەزراندنی دەزگای ناوبراو، هەندێك قسەی هاندەرانەی بۆ کردین. دوای ئەمە ڕووداوی ٣١ی مارت هاتە مەیدان، کە سێر ئەرنەستی خستبووە گومان و دوودڵییەوە. چەند ڕۆژێك دوای ڕووداوەکە، لە پاریس چاوم پێی کەوت. بۆ هەمان بابەت منی داوەت کرد بۆ لەندەن. دوای ئەوەی، لەبەر بانگکردنەکەی، ڕۆیشتمە لای، چونکە ئیدی بەنیاز نەبووم بگەڕێمەوە بۆ ئەستەنبووڵ، داوای لێبوردنم لێ کرد لەسەر ئەوەی کە ساردبوومەتەوە لە بەڕێوەبردنی کاری (بانکی نەتەوەیی). دوابەدوای ئەوە، سەرباری ئەوەی کە دڵگرانیی خۆی و گەورەبەپرسانی ئابووریی ئینگلتەرەی بۆ دەست لەکارکێشانەوەم پێ ڕاگەیاندم. لەبەر پێداگرتنی من، لەسەر ئەوە ڕازی بوو کە هەرکاتێك بمەوێ بتوانم کاروباری بەڕێوەبردنی ئەوکان بگرمەوە ئەستۆ. لەلایەکی تریشەوە، "جاوید بەگ" کە پێشتر، بە جەختکردنی من، بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرێتیی بانکی نەتەوەیی دامەزرابوو و دوای ئەم ڕووداوانە بووبوو بە وەزیری دارایی، داوای لە سێر ئەرنەست کاسەل کردبوو لەباتی خۆی، هاوکاری ئابووری خۆی، یانی "حوسەین جاهید بەگ"[28] دابمەزرێنێ. ئەمە ئەو هەموو

---

[28] هونەرمەندو سیاسەتمەدارێکی تورکە، ساڵی ١٨٧٤ لە (بالیکەسیر) لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٥٧ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە. ساڵی ١٨٩٦ مەکتەبی بەڕێوەبەرایەتیی سیاسیی تەواوکرد. ١٨٩٦ تا ١٩٠١، ڕۆمانی (سەروەتی فونوون)

**ڕووداوانــه نــهبوون کــه هاتبوونــه گــۆڕێ. بــهڵام دوژمنــانی ئــازادیو مهشــرووتییهت، تــا ئهنــدازهی ڕهتکردنــهوهی ئــهم خزمهتانــهی ئێمــه، بــه شێوهیهکی چاونهترسانه ههڵسوکهوتیان کرد.**

**لهگـهڵ هـهموو ئهمانـهدا، ئـهم یادداشـتهی "جاویـد بـهگ"[٢٩] کـه لـه خوارهوه وهك خۆی دهینووسمهوه، به شێوهیهکی ئاشکرا باسی ههوڵـه تایبهتهکانی منی تێدا کراوه بۆ دامهزراندنی دهزگای ناوبراو.**

---

بوو بـه ڕۆمـانێکی ناسـراو. دوای مهشـرووتییهتی دووهـهم، دهسـتی بـه نووسـینی سیاسی کرد. ڕۆژنامهی "طهنین"ی دهرکردو، کاری وتهبێـژی "کۆمهڵـهی ئیتیحـادو تهرهقی"ی گرتهئهستۆ. دواتر بوو به نوێنهری ئهستهنبووڵ. لهکاتی شهڕدا، لهلایـهن ئینگلیزهکانهوه دوورخرایهوه بۆ ماڵتا.
لــه گهڕانهوهیــدا، دووبــاره "طــهنــین"ی دهرکــردهوه (١٩٢٢–١٩٢٥). (١٩٢٥–١٩٢٦) بهڕێوهبــهرێتیی کۆمــار دووری خــستهوه بـۆ چـۆرووم. دواتــر بـوو بـه نوێنــهری پارلــهمان (ئهسـتهنبووڵو قـهرس) (١٩٣٠–١٩٥٠). (١٩٣٣–١٩٤٠) گۆڤاری "بزووتنـهوهی فیکـری– فکر حرکتلری"ی دهرکرد که کاتی خۆی زۆر کاریگهر بوو (٣٦٤ ژماره). (١٩٤٨ – ١٩٥٧) ههتا کاتی مردن، ئهرکی سهرنووسهریی (ئولوس)ی ههبوو که ئۆرگانی ڕاگهیاندنی پارتی کۆماریی گهل (CHP) بوو. ناوبراو زیاتر له (٦٠) بهرههمی نووسراوو وهرگێڕانی ههیـه، که گرنگترینیان: (ژیانی خهیاڵی–١٨٩٩)، (ڕووی ڕاستهقینهی ژیان ١٩١٠)، (بۆچی کهسی تر فریـو دهدهم–١٩٢٤)، (لـهنێو خهیاڵـدا، ڕۆمـان–١٩٠١)، (ئازۆوهکـانم–١٩١٠–ڕهخنـهیی)، (بیرهوهریه ئهدهبیهکان ١٩٣٠)، (بیرهوهریه سیاسیهکان–١٩٧٦).
[٢٩] بهڵـگهکه خۆیو وهرگێڕدراوهکهی:
دهقی بهڵـگهکه:

((ڕیزداریتان هیوای منه

ڕێزو سوپاسی خۆم سەبارەت بەوەی کە منی کوێلەو بەندەی خۆتان، لەنێو دامەزرێنەکانی بانکی نەتەوەیی‌ی تورکیادا داناوە،

---

وەرگێڕدراوەکەی:

((لەگەڵ ڕێزمدا، لەبەر ئەوەی منی بەندەی خۆشتان خستوەتە ناو کاروباری دەزگای بانکی نەتەوەیی، ڕێزو سوپاسی خۆمتان پێشکەش دەکەم.

بەداخەوە بارودۆخی ئابووری‌ی نەتەوەکەمان زۆر خراپەو، بە بۆچوونی من، هەرجۆرە هەوڵدانێك بۆ چاکسازی‌ی ئەم وەزعە، یەکێکە لە گرنگترین خزمەتەکان بۆ نیشتمان. حەزرەتی ئەفەندی، سەرباری ئەوەی کە بە سوپاسێکی فراوانەوە پێشنیارەکەتان پەسند دەکەم، جێ‌ی خۆیەتی دووبارە ڕێزو سوپاسی خۆمتان سەبارەت بە هەڵبژاردنی من بۆ پێکهێنانی ئەم ئەرکە نیشتمانییە پێشکەش بکەم.

۱۹ای کانوونی یەکەمی ۱۳۲٤

محەمەد جاوید

پێشکەش دەکەم. هەموو هەوڵدانێك کە بێتە هۆی چاکی و پێشکەوتنی بـــاری ئـــابووریی گەلەکـــەمان، بـــە شـــتێکی گرنگـــی لەقەڵـــەم دەدەم.هەرچەندە پێشنیازەکەتان بە ڕێز سوپاسەوە پەسند دەکەم، هەروەها سەبارەت بەوەی کە منی کۆیلەی خۆتان بۆ بە پێکهێنانی ئەرکی نەتەوەیی ئامادەکردووە، دەمەوێ دووبارە ڕێزو سوپاسی خۆمتان پێشکەش بکەم)).

**١٩ای کانوونی یەکەمی ١٩٠٨**

**محەمەد جاوید**

# بەشی دووهەم

## دوورخرانەوەی ئارەزوومەندانە

## بەرەو ئەرووپا ...

بەشێوەیەکی گشتی، هەرچەندە تەماشای رابردووی درێژخایەن دەکرێت، ڕۆژهەڵات مێژوو و بەسەرهاتی سەیروسەمەرەی هەن. بۆ نموونە، جاری وا هەیە پادشایەك بەرچاو دەکەوێ کە تا ئاسمان بەرزو پیرۆز کراوە، یاخود دیاردەیەکی نائاسایی گەورەییەکی خەفەتاویی دراوەتێ و، هەندێك جار نەهامەتیەکانی ئافاتێکی ڕاگوزاری و وێرانکەر دەردەکەون و، هەندێك جاری تریش دەرکەوتن و کوژانەوەی هەزاران خراپە کە ویژدان دەلەرزێنن و مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان دەکەن، دەبینرێن. لەبەر ئەوەی ئەم هەموو تایبەتمەندیانەی ڕۆژهەڵات، پشت بە زانیاری و کولتوور نابەستن و پابەندی بیرو بۆچوون و ویژدان نین، هەر کە پەیدا دەبن، مەحکوومی مەرگ و نەمانن و لە مەزاری فەرامۆشیدا دەنێژرێن. بە شێوەیەکی ئاسایی، لەبەر ئەوەی لەسەرەتادا ژیری و دانایی و لەجێی خۆدا نەبوون و، بە دانایی و ژیری نەکراون، نابێ لە ئەنجام و کۆتاییدا بەدوای پەندو ئەزموونـدا بگەڕێین. بەداخەوە سەرتاپای ئەوساتە پڕ لە ئازار و دوودڵییەی کە لە پاشاوە تا وەزیرو، لە تاکێکی ئاسایی‌یەوە تا دەستبەژێرەکان، هەموومانی تێدا

ژیاوین، لەگەڵ هەزاران ڕووداوی تاڵو مێژووی پڕ لە کینەو تووڕەییماندا، هیچ ئەزموونێکمان پێنابەخشن و پڕن لەو شتانە کە دەبنە مایەی شەرمەزاری. ئەوەتا دیارە، بگرە پەندێکی بچکۆلانەیش، لەناو ویژدانماندا بەدی ناکرێ. تەنانەت زۆر سەیرو بێچارەین، هەر دینێك فەرمانی ملکەچیی بەرامبەر بە زوڵمو زۆرداری دابێ، دینەکەی ئێمەش ئەمەی کردووە بە ئەرکێکی سەرشانمان.

بەڵام ئێمە وەك ئەوەی دڵی زۆرداران و تێرنەخۆران بدەینەوە، وەها هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەین. ئیسلامەتی و زۆردارای، بە هیچ جۆرێك پێکەوە ناگونجێن. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا وڵاتەکەمان بووە بە مەیدانی جێبەجێکرانی کارە گڵاوو پۆخڵەکانی زۆرداران. کەس ناتوانێ، بەپێچەوانەوە، لافی هەبوونی شتێکی تر لێبدات.

با زۆر بەرەو ڕابردوو نەگەڕێینەوە. مەگەر دیاردە خراپەکانی شەڕێکی ژیانیی درێژخایەن لەم سێ ساڵەی دواییدا بە باشترین شێوە ئەم ڕاستییە ناخەنە ڕوو ؟!

لەکاتێکدا بە کاریگەریی ئەم بۆچوونانە کە پێکەوە هەڵناکەن و بەریەك دەکەون، بە خەمو ئازارێکەوە بەرەو ئەورووپا دەڕۆیشتین، بە هەموو نیگەرانی و دڵشکانێکمەوە، تەنیا بۆ ساتێکیش بیری نیشتمان و داهاتوومانم لەیاد دەرنەدەچوو. سەدان نەفرەت لەو کەسانە بێ، کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان، تەنیا هیواو تیشکی درەوشاوەی ڕزگاریی ئێمەیان لەڕێی وتارێکی کۆنەپەرستانەوە کوژاندەوە !

هەرچەندە ئەو نەوە نانکوێرو نەخۆشەم دەهێنایە بەرچاوی خۆم، کە بە هەڵەشەییەکی زۆرەوە گەمەیان بە چارەنووسی وڵاتێکی فرە

پێکهاتەو ناجۆری وەکوو عوسمانی دەکرد، بە هەموو مەترسییەکی خۆیەوە ترسی نزیکبوونەوەی لەناوچوونی خۆمانم لێ دەنیشت.

بە قسەی هەندێك کەس، گوایە ئێستا قۆناغی مەشرووتییەت و، بە شێوەی وتنی تایبەتی خۆمانیش قۆناغی (دڵئارایی‌ی مەشرووتییەت) لە ئەستەنبووڵ لەئارادایەو، ئێمەش بە تووڕەیی و خەفەتێکی پڕ لە حەسرەتەوە هەموو وردەکاریەکانی ژیانی ئەو هەشت مانگەمان دەهێنایە پێش چاوی خۆمان. لەوەش تێدەگەیشتم کە ئەم ڕەوتە هیچ پەیوەندییەکی بە بەختیاری و ڕزگاری‌ی ئێمەوە نییەو، بە هیچ جۆرێکیش شایستەی ئەوەش نییە. لەو هەشت مانگەدا، ئەگەر پەردەی مەشرووتییەتت لەسەر هەر کردەوەیەك و هەر ڕووداوێك لابدایە، ئەوا بەرژەوەندی و ملهوڕی و پەرۆشی بەئاشکرا دەردەکەوتن. دیارە ئەوانەی وا دەبوون بە هۆی ڕوودانی ئەم کارەساتانە، وەرەو ئازایەتی‌ی خۆیان لە هێزی سوپاوە وەردەگرت، کە کردبوویان بە هاوبەش و هاوکاری خۆیان لە کاروباری سیاسیدا. بەشداری پێکردنی سەربازو سوپا و دەستوەردانیان لە کاروباری سیاسی، خۆی‌لەخۆیدا مانای ئامادەکردنی مەزارێك بۆ حکوومەت و مەشرووتییەتی دەگەیاند. بە بۆچوونی من، گەڕان بەدوای بەڵگەی تردا بۆ ئەم مەسەلەیە پێویست نییەو، هەمووشتێکی بە ڕوونی لەبەر چاوە. هەرکاتێك وەجاخی (یەنی‌چەری) [ سەربازەکانی حکوومەتی عوسمانی، وەرگێڕ] دەستی وەرداوەتە شێوازی بەڕێوەبردنی وڵات و ویستوویەتی سیاسەت بکات، ئەم خەڵکە تووشی بەڵاو نەهامەتی و وەجاخکوێری بووە.

ئەو هێزە بەختیارەی وا لەڕێگەی پاراستنی نیشتماندا و لە قۆناغی داگیرکاریەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، مێژوەکەمانی پڕکردووە لەو

ڕووداوانەی کە گەلی هەڵبژێردراوی ئێمە شانازییان پێوە بکەن، تەنیا لە زەمینەی ئەو کارە پڕ لە دژواری و زەحمەتیەدا کەڵکی هەبوە. بەپێچەوانەوە، کاتێك خۆی تێکەڵی کاروبای سیاسی کردووە، بووە بەهۆی کەوتن و دوڕان و زیاتربوونی زەرەرو زیانەکانمان.

خۆڕزگارکردن لە پەنجەی نەخۆشی و درمی بڵاوی سیاسەت لەنێو سوپادا، کە بنەماکانی فەرمانبەرداریی عەسکەری تێك دەدات، شتێکی ئاسان نییە. بەڵام کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، لەبەر سەودای حکوومەت و بوون بە پارتی گوێڕایەڵ نەبوو کە بەتایبەت سەرچاوەی هەموو خراپییەکانی ئێستایەو، لەپێناوی ویست و داخوازی پاراستنی بەرژەوەندەکانی خۆیدا، چاوپۆشیی لەم ڕاستییە مێژووییە سادەیە کردو کەوتە دوژمنایەتی ی ئەوانەش کە ئەمەیان دەهێنایە سەر زمان.

لە شیکردنەوەکانی خۆمدا سەبارەت بە هەلومەرجی کات و ئەنجامە خراپ و ڕووخێنەرەکانی ئەو ڕێگایەی کە گرتوومانەتە بەر، لەو باوەڕەدا نەبووم کە زەمان هۆی وازهێنانەکەی من و ئەوشتەی وا لافی پێوە لێدەدرا، بەزوویی و بە شێوەیەکی خوێناوی بخاتە مەیدان. بەڵکوو وامدەزانی مەترسیەکان زۆر نزیك نین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی ئەنجامی قورسیان لێ دەکەوێتەوە. بەڵام لەناکاو دەستێکی شاراوە بە فیشەکێکی دەمانچە مێشکێکی کون کردو برینی کردە دڵی مەشرووتییەت و تێپەڕ بوو.

لەمەودوا، ئیدی بیرو قەڵەم بوون بە تاوانبارانی سزای مەرگ. تاوانێکی سەیر ڕووی دابوو، "حەسەن فەهمی بەگ"[30]، وەك

---

[30] ساڵی ١٨٦٦ لەدایك بووەو، ٥ی نیسانی١٩٠٩ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە. یەکێك بووە لەو ڕۆژنامەنووسانەی کە سەردەمی مەشرووتییەت کۆمەڵەی

شەهیدێکی بێتاوان، بەڵام ئەو بکوژە ناپیاوەی کە ئەو تاوانەی کردبوو، دیار نەبوو. پێم وایە دادو دادپەروەریی هەمیشەیی، ئەمەش پەیدا دەکات. لەوەدەچێ یەکێکی ژەهراویکراوی ناو کۆمەڵگەیەکی سەرشێت و بێسەرەوبەرە سزا نەدرێ، بەڵام ئاشکرایە کۆمەڵەی بکوژە ڕاستەقینەکانی سزای خۆی هەر دەدات. هەر دوابەدوای ئەم مەرگەساتە، کارەسات و تراژیدیای ٣١ی مارت دێتە ئاراوە.

کاتێک ئەستەنبووڵ و "کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی"م بەجێدەهێشت، وەك چۆن لە داوانامەی دەست لەکارکێشانەوەکەشمدا ڕشوونم کردبووەوە، پێم وابوو ((بەپێی بەڵگەو ڕووداوە مێژووییەکان، دەستوەردانی چینی سەرباز لە کاروباری سیاسیدا، مەترسی و زیانێکی گەورەیە بۆ بەرژەوەندەکانی وڵات و نیشتمان)).

هەروەها ئاماژەیەکیشمان کردبوو بۆ دیاردە خەماویەکانی ئەوکاتەو، ئەوەشم وتبوو کە" ((بارودۆخی ئێستای ئێمە، نموونەو بەڵگەیەکی بەرچاوی ئەمەیە)).

---

ئیتیحادو تەرەقی کوشتی. لە قوتابخانەی زانستی بەڕێوەبەرێتیدا خوێندنی تەواو کردووە. لەکاتی حوکمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمدا، ڕای کردوەتە پاریس و، لەوێشەوە چووەتە میسر. لەگەڵ ژۆن تورکەکانی تردا، دژ بە ئیدارەی سوڵتان عەبدولحەمید، کەوتووەتە کارو خەبات. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم، گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و، لە ڕۆژنامەی "سەربەستی"دا بووە بە سەرنووسەرو بەرامبەر بە ئیدارە ستەمکارەکەی ئیتیحادو تەرەقی ڕاوەستاوەو نارەزایی خۆی دەربڕیوە. لە ئەنجامیشدا، بەهۆی نووسراوەکانی لەدژی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، لەسەر پردی (غەڵەطە) کەوتوەتە بەر دەستڕێژی گوللەی نەیارانی و، کوژراوە.

لە هەموولایەکی وڵات و ئەو جێگایانەدا کە کۆمەڵە زۆرداری و ستەمی تێدا دەکردو، سەرباز دەستتێوەردانی نایاسایی ی هەبوو و کێشەی بۆ پارتەکان دروست دەنایەوەو، لەو پارێزگایانەدا کە ڕەگ و ڕیشەیان داکوتابوو، وشەی ئاسایش بوو بە خەیاڵێکی بێپاراستن و شتێکی بێواتا.

بەشێوەیەکی گشتی، نیشانەکانی ناڕەزایی لە هەموولایەکەوەو لە گشت پارێزگاکاندا بە ئاشکرا دەردەکەوتن. بەڵگە خوێناویەکانی بێئیرادەیی و کەمتەرخەمی ی نەزانانەی ئەوکاتەمان، ڕووداوەکانی کوژرانی شەهیدی بێتاوان حەسەن فەهمی بەگ و تراژیدیای ٣١ی مارت و ڕووداوە تاڵەکانی ئەدەنە (ئەطەنە)یە.

## ٣١ی مارت

چەند ڕۆژێك دوای سەفەرەکەی ئێمە بۆ ئەوروپا و دوای شەهیدبوونی حەسەن فەهمی بەگی شەهیدی ئازادی ی ڕاگەیاندن بە شێوەیەکی ناسۆراوی و جەرگبڕ، ڕاپەڕین و کودەتایەکی عەسکەری لەدژی گرووپی ئیتیحاد کە بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عوسمانیی تێکەڵ وپێکەڵ کردبوو و لەبەر بەرژەوەندی خۆی وڵاتی بەتاڵان بردبوو، تەقییەوەو مەترسییەکی بە خوێن ڕەنگکراو بوو بۆ وڵاتەکەمان، بە چەشنێك کە تا ئەمڕۆکەش هەر بووینەتە بێچارەو لێقەوماوی دەستی ئەم ڕووداوە. هەر لەبەر ئەمەش زنجیرەی ئەو ستەمانەی کە کراون و ئەو خراپە بێکۆتاییانەی وا بە کەڵکوەرگرتن لەم هەلە لە مێژووی شۆڕشەکەماندا کەوتوونەتە بەرچاو، چەندین لاپەڕەی ڕەشیان پڕ

کردوەتەوە کە مایەی شەرمەزاری و ترسی گەلەکەمانن. ئەمڕۆ کە ئەم لەکە ڕەشە پاکنەکراوانە دێنینەوە پێش چاوی خۆمان، ناتوانین لەوە تێبگەین کە بە چ شێوەیەك دەتوانین لە دەست ئەم سەرهەڵدان و دەرکەوتنە پڕ لە تووڕەیی و تۆڵەی دادو عەدالەتی هەمیشەییە ڕزگارمان بێ. ئەمە دادو ڕاستییەکە، بەناوی ئەو کەسە سووك و هیچ وپووچانەوە کە ئاوا ئێمەیان تووشی بێچارەیی و پەرێشانی کردووە. هەروەهاشە، لەبەر ئەوەی بەرامبەر بە چەندایەتی ی کاری ئەوان، چاوەڕوان ماینەوەو تەماشامان کرد، ئێمەش هەموومان تاوانبارین. ئەمە زیانێکی زۆری بۆ وڵات و خەڵك هەبوو. بەداخەوە هەندێك لە (ئەفسەرە سیاسیەکانمان)، بۆ غرووری پارێزگاریکردنێکی فراوانی بێماناو، بە وروووژاندن و هاندانی گرووپێکی بەرژەوەندپەرست و خوێڕی، خۆیان ون کردو، بوون بە سۆنگەی دروستبوونی ئەم ڕووداوە لە ڕاپەڕینەکەدا کە هێشتا پەندی لێ وەرنەگیرابوو.

بەبێ دەربڕینی ناسنامەی خاوەنی ئەو قسانەی کە دەیەوێ ئەم ڕووداوە تاڵە لەژێر پەردەیەکی فەرامۆشیدا بشارێتەوە، دەمەوێ دووبارە ئەم قسانە بهێنمەوە ڕوو: ئەم ڕووداوە دەیەوێ نیشان بدات، کاتێك ئەو سیاسەتەی وا وەکوو شتێکی شیرین دێتە بەرچاو، دەکەوێتە ژێر دەستی سوپاو سەربازان، لە چ ئاستێکدا دەبێ بە هۆی لەناوچوون و، تا چەندە وێرانکەر دەبێ. ئەگەر بە کەمێك ئینساف و ویژدان و بەزەییەوە بهاتنەوە بە بارودۆخی خەڵکی لێقەوماوی ئەم وڵاتەوە، بڕوانینە ڕووداوی خەماوی و تراژیدی ی ٣١ی مارت[٣١]، ئەوا بە

---

[٣١] ئەو ڕاپەڕینەیە کە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم لەدژی ئیدارەی ئەسەنبوول بەرپاکرا. لەبەر ئەوەی ڕاپەڕینەکە، بەپێی ساڵنامەی ڕۆمی، لە ٣١ی مارتی ١٣٢٥دا (١٣ی نیسانی١٩٠٩) کرا، هەر وا ناونراو بوو بە ڕووادوی ٣١ی

ئاشـكرا دەردەكـەوێ ئـەم ڕووداوە چـەندین ڕۆڵـەی ئـەم وڵاتـەو ئاپۆڕەیـەك بێچارەی لەناوبردو بەدبەختی كردن.

---

مـارت. شـەوی ١٣ی نیـسان لـە (تەقـسیم قـشلاسی) هەنـدێك سـەباز بـەرەنگاری ئەفـسەرەكانیان بوونــەوەو، لەبــەردەم مەجلیــسی مەبعووســاندا كۆبوونــەوەو، داواكاریـەكانی خۆیـان لەسـەر بـەڕێوەبردنی وڵات بـەپێی شـەریعەت ڕاگەیانـد. حكوومەتی حوسێن حیلمی پاشا ڕێگەی پێكهاتنی لەگەڵ سەرهەڵداوندا گرتەبەرو، وەزیرانی كابینەكە یەكە بە یەكە دەستیان لەكار كێشایەوە.
ئەم ڕاپەڕینە كاری كردە سەر مەجلیسی مەبعووسانیش،و، ئەو ئەندامانەی كە سەر بە كۆمەڵـەی ئیتیحادو تـەرەقی بـوون، لـە ئەسـتونبووڵ چـوونە دەرێو ڕایـان كـردو خۆیان شاردەوەو نەڕۆیشتنە ناو ئەنجومەن.
هەندێك لەو ئەفسەرو نوێنەرانەی كە دەستگیر كرابوون، لەوانەی كەسەر بە كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بوون، كوژران. بەرامبەر بەمە، كاتێك كۆمەڵـەی ئیتیحادو تـەرەقی كۆنترۆڵی ئەستەنبووڵی لەدەست دەرچوو، لە (سەلانیك) كە ناوەندی هێزەكەی بـوو، سێ سوپای خستە جموجووڵ بۆ سەركوتكردنی سەرهەڵدانەكەو سوپای پاكسازی دامـەزرا. ئـەم سوپایە شـەوی ٢٤ی نیسان ڕژایـە نـاو ئەسـتەنبووڵ،و باروودۆخەكـەی خـستە ژێـر ڕكێفـی خۆیـەوە. دەشـێ بگـوترێ كـە دەیـان لایـەن زیـاتر لەپـشت ئـەم ڕووداوەوە بوون، چونكە هـەموو ئۆپوزیـسیۆن پـشتگیریی ئـەم ڕاپەڕینـەیان دەكـرد. بـەڵام لەهـەمان كاتیـشدا ئـەم ڕووداوە، لـە هـەموو لایـەنێكی تـر زیـاتر، بـە قـازانجی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی تەواوبوو.
هەموو ئۆپۆزیسیۆن لەناوبراو، ئەو كەسانەی وا ڕۆڵیـان لـە ڕووداوەكـەدا هـەبوو، بـە شـێوەیەكی قـورس سـزادران،و، لـەوەش گـرنگتر، سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووهـەم لەسەر تەختی دەسەڵات لابراو دوورخرایـەوە بـۆ سـەلانیك،و، بـەو جـۆرەش كۆمەڵـەی ئیتیحادو تەرەقی لە مەیدانی سیاسیدا بوو بە هێزی یەكەم.

## ٣١ی مارت ڕووداوێکی کۆنەپەرستانە نییە

هەر لە زووەوە لە ڕاگەیاندنەکانی خۆمان و هەندێك ئۆرگانی ڕاگەیاندنی دنیای دەرەوەشدا، سەبارەت بەوەی کە ڕووداوی ٣١ی مارت شتێکی کۆنەپەرستانە بووە، هەندێك بۆچوونی بەمەبەست و تاکەکەسی خراونەتە بەرچاو.

ڕۆژنامەکانی وەك "طەنین" و "لاپەڕە پیسەکان- أوراق ملوثە" هەمیشە هەوڵی ئەوەیان دەدا ڕووداوی ٣١ی مارت بە کاردانەوەی کۆنەپەرستان بەرامبەر بە شۆڕش لەقەڵەم بدەن و، بەو جۆرە بە دنیای بناسێنن. سەبارەت بەوەش کە ئەورووپا لایەنگری ئازادی و مەشرووتییەتی گەلەکەمان نییە، شتی زۆری گەوجانەیان بڵاودەکردەوە. بێگومان هۆیەکی سەرەکیی بڵاوبوونەوەی بەرژەوەندپەرستی وەك هێزێکی سەیر لە هەموولایەکی ئەم وڵاتەدا، دنیای تاریکی نەزانیی خەڵکەکەمان و بێبەشبوونیانە لە زانست و زانیاری بە شێوەیەکی ئاسایی. نەزانی و کەمتەرخەمیی خەڵك، تەنیا چەکی سەرکەوتنی دوژمنانی مەشرووتییەت و خوێڕیەکانە. لەڕاستیدا نەزانی و کەمتەرخەمیی خەڵك، گەیشتە بەرژەوەندەکانی خۆشیان.

٣١ی مارت، وەك ئەنجامی ژیانێکی پڕ لە خۆسەپاندن و گوشار و تەنگ پێهەڵچنین و پاوانخوازی و زۆرداری هاتە مەیدان، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە دەوترێ، (کاردانەوەیەکی کۆنەپەرستانە) نەبوو و، لەم بارەیەشەوە چەندین هۆ و بەڵگە هەن کە دەرفەت بۆ هیچ گومانێك ناهێڵنەوە.

ئـــەو کۆنەپەرســـتیەی وا ئێمـــە لێـــی تێدەگـــەین و هـــەموو بیرمەنـــدەکانیش لەســـەری هـــاوڕان، ڕاپـــەڕین و هەوڵـــدان بـــۆ لابردنـــی حکوومـــەتی خـــەڵك کـــە ڕێـــز لـــە ئـــازادی و مەشـــرووتییەت دەگـــرێ، هێنانەوەی حکوومەت و دەسەلاتێکی ڕەها[٣٢] و دیکتاتۆرییە.

ئەو ڕاپەڕین و سەرهەڵدانانەی کە بەم جۆرە مەبەستانەوە دەکرێن، بە کۆنەپەرست و دواکەوتوو لەقەڵەم دەدرێن. گرووپـی کۆنەپەرستان ئەو کەسانەن کە دژی دەسەلاتی بەڕێوبەرێتییەکی ئازادیخوازن. هەر بۆیە ئەم گرووپە کۆنەپەرستە، لە سەرەتای کارەوە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ (مەجلیسی مەبعووسان)ی لابرد. ئێمە بەبێ کەم وکوڕی و بەم مانا سادەیەوە کۆنەپەرستی دەناسێنین. لە هیچ جێگەیەکی ئەم دنیایەدا دینداریکی ئاسایی یا دەمارگرژ بە خۆڕایی بە کۆنەپەرست لەقەڵەم نادرێ.

ئەگـــەر وابـــێ، پێویـــستە ئینگلیزەکـــانیش کـــە هـــەموو مرۆڤـــە ئازادیخوازەکـــان وڵاتەکـــەیان بـــە پێـــشەنگی شارســـتانی و خـــاوەنی بەڕێوەبەرێتییـەکی بـاش و بـەختیار دەزانـن، بـە کۆنەپەرسـت لەقەڵـەم بـدرێن، چـونکە هـەم دینـدارن، هـەم لـە بـاری دینیـشەوە تاڕادەیـەك دەرمارگرژییان هەیە. بەڵام ئایا دەتوانرێ ئەو مرۆڤانە حاڵی بکرێن کە هەموو کێشەیەك دەکەنە شتێکی واتا نادیارو مایەی تێنەگەیشتن ؟ یاخود سەپاندنی ئەم ڕاستییە بەسەر ئەو مێشکانەدا کە خۆیان لە

[٣٢] سیـــستەمێکی سیاســـییە کـــە هـــەموو دەســـەلات لـــە دەســـتی تاکەکەســـێکدا کۆدەکاتەوە. تایبەتمەندی بەرچاوی ئەم سیستەمە ئەوەیە کە دەسەلات لەڕێگەی هیچ دەزگایەکی دادوەری، یاسایی، دینی، ئابووری و سیاسییەوە کۆنترۆڵ ناکرێ.

وشكه بیروباوەڕیدا خنكاندووەو زۆر به باشی لەم شتانه تێدەگەن، مومكینه یان نا ؟

لە ٣١ی مارتدا چی كرا ؟ ستوونه ڕاوچییەكان كه به (هێزی كۆمەڵە)و ڕێپیشاندەری مەشرووتییەت ناونرابوون‌و، ڕاپەڕین‌و سەرهەڵدانی خۆیان بەرامبەر بە ئیدارەی پێشوو ڕاگەیاندبوو، ئەركی پاراستنی مەشرووتییەتیان دژ بە هەر جۆرە دەستدرێژییەكی چاوەڕوانكراو پێ سپێردرابوو. شایانی باسە، ئەم هێزە تا ڕووداوەكانی ٣١ی مارت، جگە لە كاری زۆرداری‌و گوشارو تەنگ پێ‌هەڵچنین، بۆ هیچ كارێكی تر بەكار نەبرابوو.

دەستەی (فیداكارانی گەل) كه وایان زانیبوو ئازادی لە وڵاتدا هەیەو، بۆ ئەو مەبەستەش ڕێكخستنیان بۆ خۆیان پێك هێنابوو، لەبەر تۆمەتەكانی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، بەهۆی (چەكی ئازادی)یەوە لەناوبران.

ڕێزو سوپاس بۆ ئەو كردارانەی كه قارەمانە ئازاكانمان لە خانەی میهرو بەزەیی‌یەوە تا پەرلەمانی نوێنەرانی خەڵك (مەجلیسی مەبعووسان)و وەزارەتی جەنگ ئەنجامیان دابوون ! بەتایبەت بۆ دواڕۆژەكانی ڕووناكی‌و ئازادی !

لە كۆبوونەوەی شەوانەی مەیدانی وەزارەتی جەنگ‌و زۆر جێگەی ترو، تەنانەت نێو دیمەن‌و وێنەی گوزەرەكانیشدا، دوور لە فەرمانبەریی عەسكەری، ئەم جیدییەتە عەسكەرییەیان نواند. ئەم بێچارانە بە پارێزگاری‌و چاودێریی وەزارەتی جەنگ‌و، بەتایبەت

لەڕێی ئاسانکاریەکانی مەحمود موختار پاشای قارەمانەوە[٣٣] بۆ ڕیفۆرمی عەسکەریو هەوڵەکانی بۆ پێشخستنو گەورەکردنی سوپا، توانییان هەلی خۆنیشاندانو دەرکەوتن بدۆزنەوە. ئەمانەش بەشێك بوون لە کردەوەکانی ئەو هێزە پیرۆزو ڕێپیشاندەرەی مەشرووتییەت لە ئەستەنبووڵ!

هێزێکی عەسکەری کە فەرمانبەری عەسکەری لەناودەباتو، بەتایبەت جەستەی مەشرووتییەت بریندار دەکاتو دەست لە

---

[٣٣] مەحمود موختار پاشای قاترچی ئوغلوو، ساڵی ١٨٦٧ لە ئەستەنبووڵ لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٣٥ لە ئەسکەندرییە کۆتایی بە ژیانی هاتووە. یەکێکە لە فەرماندەکانی سوپای عوسمانییو، وەزیفەی باڵوێزیو وەزیریی بینیوە. کوڕی غازی ئەحمەد موختار پاشاو نەوەی محەمەد پاشای قاترچی ئوغلووی بورسایییە. لە ئەستەنبووڵ لە ئاکادیمیای جەنگو، لە قوتابخانەی جەنگی (Metz) ئەڵمانیا دەرسی خوێند. دواتر لە لیوای تایبەتی پرووسیادا دەستی بەکار کرد. دوای گەڕانەوەی بۆ تورکیا، لە دایرەی ئەرکانی جەنگ ئەرکی پێسپێردراو، لە وەزارەتی جەنگیش دەرسی گوتەوە. لە سوپای ئاسالیادا وەك سەرهەنگ (فەرماندەی تیپ) لە شەڕەکانی فەلەستینو چەتاڵجەو دەمەکەدا بەشدار بوو. دواتر بوو بە دووهەمین سەرۆکی هێزی پیادەی سوپا (١٩٠٠). دوای مەشرووتییەتی دووهەمیش، وەك فەریقی یەکەم، بوو بە فەرماندەی لقی یەکەمی سوپای تایبەت. نێوان ساڵانی ١٩١٠ -١٩١٢ ئەرکی پارێزگاریی شاری ئایدینو پۆستی وەزیری هێزی دەریاییی وەرگرتو، دوای هەموو ئەمانەش بوو بە باڵوێزی گەورە لە بەرلین (١٩١٣). بەڵام پاش ساڵێك دەستی لەکار کێشایەوەو، ئیدی وەزیفەی ڕەسمیی وەرنەگرت. هەندێك بەرهەمی بەم ناوانەوە (ڕۆژنامەی شەڕ، چاوپێداخشانێك بە ڕابردوودا، بیرەوەرییەکی تاڵ، Eve'mentsd' Ocient, La Turquie l' Allemagne- کە بە زمانی فەڕەنسی نووسراون) هەیە.

کاروباری بەڕێوەبردن وەردەدات، ئەوان کە بە هاوکارێك ناوی دەبەن، شتێکی ئاسایی‌یە. نەکرووزانەوەو سکاڵانەکردنی ویژدانی ئەندامانی عەسکەری‌و بەشی ئابووری‌ی کۆمەڵە لە ئاستی چۆنیەتی مردن‌و دیمەنی مەرگی خەماوی‌ی ئەفسەرە نەزان‌و بێچارەکاندا، شتێکی سەرسوڕهێنە (ئەڵبەتە هێشتا ئالوودەی پیسترین جۆری شەرمەزارین).

سوپاو سەرباز کە لەم جۆرە خزمەتە ئایەخانەدا بەکار دەبران، لەبەر قسەو باسی سەبارەت بە کارەساتی مەرگی حەسەن فەهمی بەگ کە ئامانجی سەرەکی‌ی کۆمەڵە بوو، بەلاساییکردنەوەی کۆبوونەوەی (فیرۆزویك) [٣٤] لە مەیدانی (ئایاسۆفیا)دا کۆبوونەوەیەکیان سازکرد. وەك چۆن لە سەرەتاکانی ئەم بەشەدا باسمان کرد، لە دوانامەی دەست لەکارکێشانەوەی خۆمدا داوام کردبوو سەربازو سوپا دەست لە کاروباری سیاسی وەرنەدەن. هەر لەبەر ئەمەشە کە هیچ کاتێك (ڕاپەڕین‌و سەرهەڵدانە ئارامگرەکەی) ٣١ی مارت پەسند ناکەین‌و

---

[٣٤] کۆبوونەوەیەك بە بەشداری زیاتر لە بیست هەزار کەس، بۆ نارەزایی دەربڕین دژی سیاسەتی گشتی‌و سیاسەتی ڕێگەی ئاسنی ئەمساو هەوڵدانی بۆ دزکردنە ناو ئەلبانیا، لە فیزرۆڤیك (Firzovik) سازکراو، هەر بەناوەش ناوبانگی دەرکرد. کۆبوونەوە، بە دەست تیوەردانی ئیتیحادیەکان، بە پێشکەشکردنی داوکارییەك لە حکوومەتی عوسمانی بۆداڕشتنی دەستووری بنچینەیی، کۆتایی‌ی هات (٧ی مایسی ١٩٠٨).

بەندەکانی ئەم دەقە هەشت برگەییە زیادکران‌و، ئەمەش لە پشتەکەی نووسرابوو: ((داوا لە پاشا -شاهنشا-ی بەڕێز دەکەین بۆ جارێکی تر دەستووری بنچینەیی‌و نەریتی ڕاوێژکاری بەڕێوە بەری‌و، ڕێگە لەبەردەم دروستبوونی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکدا بکاتەوە..)و، لە هەموولایەکی وڵاتدا بڵاو کرایەوە.

چەپڵەی بۆ لێ نادەین، چونکە هێشتا پێداگری لەسەر بیرو بۆچوونی پێشووی خۆمان دەکەین و دەڵێین ئەم ڕووداوە شتێکی کۆنەپەرستانە نییە. بەڵام کامەن هۆو بەڵگەکانی ئەم قسەیە ؟

بەر لە هەمووشتێك پێویستە ئەوە بگوترێ، کۆنەپەرستان تەنیا دوژمنایەتیی چوارپێنج کەسیان نەدەکرد، بەڵکوو هی هەموو نوێنەرانی خەڵکیان دەکرد. بە واتایەکی تر، پێویست بوو وەها بێ. بەڵام سەربازە ڕاپەڕیوەکان داواکاریە گونجاوەکانی خۆیان (داواکاریی گونجاو شتێکی جیاوازەو، خراپبوونی ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی عەسکەریش[٣٥] لە بنەڕەتدا شتێکی جیاوازە) لە پادشا نەدەویست، بەڵکوو ڕووی قسەیان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك بوو. ئەمەش لەکاتێکدا ئەگەر ئەمانە کۆنەپەرست بوونتیە، ئەوا تەنیا لەبەردەم (کۆشکی یلدز)دا کۆدەبوونەوەو، دوای ماوەیەکی تر ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکیشیان بەتاڵان دەبرد. بەڵام وەهایان نەکرد. لێرەدا وەڵامی لاف وگەزافێکی ڕێتێچوو دەدەینەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕاپەڕیوەکان جاڕی (شەریعەتمان دەوێ)یان دەدا کە بوو بەهۆی ئەوەی بگوترێ (بەکارهێنانی دین بۆسەرهەڵدان و ڕاپەڕین شتێکی کۆنەپەرستانەیە)و، تاوانبارکردنی ئەو کردەوەیە بێتە ئاراوە.

---

[٣٥] داواکاریەکانی ڕاپەڕینەکە، بەپێی ڕۆژنامەکانی ئەکاتە، لە پێنج بەنددا کۆدەکرایەوە: ١- لەسەر کار لاچوونی کابینە (بەتەواوەتی)، ٢- وازهێنانی ئەحمەد ڕەزاو جاهید حوسێن بەگ و تەلعەت بەگ، لە پۆستی لە سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك (پارلەمان)، ٣- ..... ، ٤- پێڕەوکردنی یاساکانی شەریعەت، - لێبوردن لە بەشدارانی ئەم ڕاپەڕینە.

ئەگەر بیر لەوە بکرێتەوە کە تێگەیشتن و زانیاریی کۆمەڵی ڕاپەڕیو لە چ ئاستێکدایە، ئەوا ناتوانرێ داوای شەریعەت کردنی ڕاپەڕیوان بە کارو چالاکییەکی کۆنەپەرستانە بژمێردرێ. ئەگەر دوای کردەوەکانی کۆمەڵەی نەفرەتیی ئیتیحادو تەرەقی، گرووپێك ڕۆشنبیری ناو خەڵك ئەم سەرهەڵدانەیان دەست پێبکردایە، دروشمی (شەریعەتمان دەوێ) بە شێوەیەکی ئاسایی پشتیوانییەکی بە خۆوە نەدەبینی. ئەو پێشەنگانەی کە بارودۆخەکەیان ئاسایی کردەوە، کەسانی زاناو ڕۆشنبیرو، سەربازە سەرهەڵداوەکانیش کەسانی بیرتەسك و نەزان بوون. ئازادی و مەشرووتییەت و، بە کورتی هەموو ئامانجێکی ئازادیخوازی، لە چاوی ئەوسەربازەوە، لەژێر چەمکی شەریعەتدا کۆدەبنەوە. وەك ئەوەی دەگوترێ داواکردنی شەریعەت، مانای گەڕان بەدوای ملهوڕی و ستەمکاریدا ناگەیەنێ. شتی سەیر ئەوەیە کە هەندێك لە مرۆڤە بیرئازادەکانیش، لە هەندێك بارودۆخی مەترسیداردا، پەنا بۆ دین دەبەن وەك چەکێکی بەئەنجام گەیاندنی گۆڕانکاری و ڕیفۆرم.

داواکاریەکانی تری سەربازە ڕاپەڕیوەکان، خستنی کابینەو لەسەر کار لاچوونی حکوومەت و وازهێنانی چەند کەسێك لە نوێنەرایەتیکردنی خەڵك و دەرکردنی لێبوردنێك سەبارەت بە خۆیان بوو.

کێشەی کوژرانی شەهیدی بێتاوان حەسەن فەهمی بەگ، ڕای گشتیی هێنابوە جۆش و خرۆش و، ئەمەش کەوتبوە ناو بەشێکی سەربازان و سوپا. سەربازەکان زیاتر باسی ناوی ئەو شەش کەسەیان دەکرد. بۆچی ناوی ئەو شەهیدە پیرۆزو پایەبەرزە لەسەر زمانی هەموان بوو، چونکە ڕای گشتیش داوای تۆڵەسەندنەوەیی دەکرد.

بەڵام، لەڕاستیدا، چارەنووس لەم بارەیەوە سەرهەڵداوانی تووشی دوو هەڵەی گرنگ کرد. نازم پاشای وەزیر داد[٣٦] و ئارسلان بەگی نوێنەری ئەنجومەن[٣٧]، دوو قوربانیی ئەم هەڵەیە بوون. پێمان وایە ڕوونکردنەوەکانی ئێمە سەبارەت بە ڕووداوە دڵتەزێنە، هەموو وردەکاریەکانی دەگرێتەوە. بە هاندانی هەندێك کەسی نیازخراپ و بەرژەوەندپەرست، ویستیان ڕەنگ و شێوەیەکی تر بدەن بە ڕووداوەکەو، لە بەرگێکی کۆنەپەرستیدا نیشانی ڕای گشتیی بدەن و، خۆ و بەخت هەموو خراپی و گەندەڵیە سیاسی و ئیداریە دووبارە زیندووکراوەکانی حکوومەتی پێشووی پێبشارنەوە و، دوژمنانی خۆیان لەژێر پەردەی کۆنەپەرستیدا لەناوبەرن.

٣١ی مارت، ڕووداوێکی کۆنەپرەستانە نەبوو، بەڵام پەتایەك بوو بۆ نیشتمان و، تاوانێکی گەورەش بوو. شتی جێی مەبەست لێرەدا

---

[٣٦] نازم پاشا، ناوی ڕاستەقینەی مستەفا و بەرپرسێکی حکوومەتی عوسمانی بووە. ساڵی ١٨٦٢ لەدایك بووەو، ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستەنبووڵ کۆچی دوایی کردووە. دوای تەواوکردنی خوێندن لە ماف و یاسادا، لە بەشی قەڵەمی وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا دەستی بەکار کرد. دواتر ئەرکی یاریدەری داوەری گشتیی شووڕای دەوڵەت و مامۆستاییی مەکتەبی یاسا و سەرۆکایەتیی دادگای تەمیزی شووڕای دەوڵەتی پێسپێردرا. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەت، کرا بە وەزیری داد. سەرهەڵداوەکان، لە سەروبەندی ڕووداوەکانی ٣١ی مارتدا، وایانزانی ئەحمەد ڕەزایەو، کوشتیان.

[٣٧] ئاسلان بەگ، ناوی ئەمیرو، ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستەنبووڵ مردووە. نوێنەری شاری (لاذقییە) بووەو، کاتی ڕووداوەکانی ٣١ی مارت، سەرهەڵداوان وایانزانی حوسێن جاهید بەگەو، کوشتیان. ناوبراو کوڕی "مستەفا ئاسلان بەگ"ی یەکێك لە پیاوماقووڵانی شاری (لاذقییە) بوو. تەرمەکەیان بە کەشتی ناردوەتەوە بۆ شارەکەی و، لەوێ بە خاك سپێردراوە.

ئەوەیە، سەرباز بە چ شێوەیەك چاونەترسییەکی وەها دەنوێنێ کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ فەرمانبەرێی عەسکەریدا ناگونجێ ؟! شایانی باسە، لێرەدا باسی ڕەوایی یا لەسەرهەق بوونو، بە پێچەوانەشەوە ناڕەوایی داخوازییەکان ناکرێ، بەڵکوو قسە لەسەر ئەوەیە کە ئەم جۆرە کارانەی سەرباز، خوا نەکردە، دەتوانێ ببێ بە هۆی لەناوچوونو پەرێشانیو بەدبەختیمان. ئێستاش لەبەر ئەم گومانو دوودڵییەی کە نائومێدیمان بەسەردا دەسەپێنێ، بەتەواوەتی لە داهاتووی مەشرووتییەتەکەمان دڵنیا نین، چونکە هێشتا سەرباز بە هەموو هێزێکی خۆیەوە خۆی تێکەڵی کاروباری سیاسیی وڵات دەکات. بەڵگەو شێوەی بەهانەهێنانەوەی ئێستامانو، بە شێوەیەکی بنەڕەتی مەشرووتییەتەکەشمان، لەم داخوزایەوە سەرچاوە دەگرن. هەندێك لە کەسە نیازخراپە بەرژەوەندپەرستەکان دەیانەوێ ئاراستەی جیاواز بە تراژیدیای ۳۱ی مارت بدەنو، هەر جۆرە درۆو دەلەسەیەك دەکەنو هەمووشێوە ناپیاوییەکیان لێ دەوەشێنەوە بۆ دەستهێنانی بڕێك پارەی بێنرخ. ئەمڕۆ ڕاستی لەئارادایە. سەرباری ئەمە، ئەو کەسانەی کە تا ئاستی نیازخراپیو پێ لێهەڵبڕین ڕۆیشتوون کە مایەی شەرمەزاریی مرۆڤن، هەمان ئەوانەن کە کینەو ڕقی پێشوویان لەدڵدایە. پێمان وایە چیتر درۆو دەلەسەکانی ئەمانە، لە دنیای عوسمانیدا، پەسند ناکرێن.

# سوپای حەرەکەت

وەك لەسەرەوە باس کرا، تراژیدیای ۳۱ی مارت لە ژێ سیستەمو پەروەردەی عەسکەری بوو. پادشایەکی گێژو ترسنۆك لە سەرووی دەوڵەتەوەو، لەنێوانیشدا هەندێك ئەندامی ئەنجومەن هەبوون کە یان پاڵیان پێوەنرابوو، یا زۆر کەسیان سوێندو پەیمانی خۆیان سەبارەت بە ئازادیو شەرەف فەرامۆش کردبوو و، خۆیان خزاندبوە کونێکەوە.

ئەوەش کە مابوەوە، کۆمەڵێکی بێبایەخی ئەندامانی کۆمەڵە بوو.

وڵات لەنێو ئاڵۆزیدا بوو، خوایە ! لەکوێ بوون ئەو قارەمانانەی ئازادی، لەکوێ بوون لایەنگرانی پارێزگاری ! پێمان وایە کۆمەڵەی نەفرەتی کە رۆڵەکانی ئەم وڵاتەی تا دەرنگانێکی شەو لەسەر پردەکە ڕادەوەستاند و بۆ کوژرانی دەبردن، لەوەیانەوە کە خۆی بە شەرەفمەند دەزانێ، تا ئەوەیان کە خراپی ناویانە، تاقە کەسێکی وا پەیدا نابێ لەوکاتەدا بیرو بۆچوونێکی باش سەبارەت بە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەدەستەوە بدات.

چەند ڕۆژێك دوای تراژیدیای ۳۱ی مارت، لەودیو دیوارەکانی ئەستەمبووڵەوە، گرووپێکی گەورەی خۆبەختکەری خۆنەویستی ئەلبانی، بولغار، یەهوودی، یۆنانیو مەسیحی، لەگەڵ چەندین ستوونی عەسکەریدا کە چادریان هەڵدابوو ڕاوەستابوون، گوایە لە دڵی خۆیاندا دەیانویست ئازادیو مەشرووتییەت لە مەترسی ڕزگار بکەن.

لەم سەدەیەدا، شێوەی چوون بۆ شەڕی خۆبەختکەرانەی کوڕانی ئیسرائیل، بە شێوەیەکی نایاب، تەنیا لە دەوڵەتی عوسمانیدا بینراوە.

ئەم سوپا تێکەڵەی حەرەکەت[٢٨] کە بە نەزانی یا شێوەیەکی زانایانەو، بە هاندان و پشتیوانیی هەندێك لایەن، بەرەو دیوارەکانی شاری ئەستەنبووڵ بەڕێ کەوتبوو، خۆی پێی وابوو بۆ پتەوکردنی بنانەی مەشرووتییەت هاتوەتە ئەستەنبووڵ. ئەم سوپایە، بەرلەوەی بڕژێتە ناو شاری ئەستەنبووڵ، بەڵێنی ئەوەی دابوو کە بەشێوەیەکی

(٢٨) سوپای پاکسازی، دەستەیەکی عەسکەری بوو، ساڵی ١٩٠٩ بە مەبەستی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی ٣١ی مارت پێك هێنرابوو. کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، لەبەر ئەوەی کۆنترۆڵی ئەستەنبووڵی لەدەست دەرچوو بوو، لە (سەلانیك) کە ناوەندی هێزی خۆی بوو، سێ سوپای بۆ سەرکوتکردنی سەرهەڵدانەکە ئامادەکرد. دەستەیەکی عەسکەری بە یارمەتیی "ساڵح خولوسی پاشا"ی فەرماندەی دووهەمی سوپا، بە فەرماندەیی سێهەمین فەرماندەی سوپا، سازوتەیار کرا. ئەم دەستەیە کە بە سوپای پاکسازی ناودەنراو، کەسانی واشی تێدابوو کە بە دڵی خۆی بەشداریی کردبوو، یەکەمین تاقمەکانی لە ١٥و ١٦ی نیساندا گەیشتنە چەتاڵجە. (مەجلیسی مەبعووسان)و (مەجلیسی ئەعیان) بەناوی پارلەمانی گشتیی نەتەوەییەوە لە (یەشیل کۆی) کۆبوونەوەو، بڕیاری تەسلیمکردنی شاریان دا بە هێزی چەکداری سوپا و، بۆ ئەمەش تەلگرافیان بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم کرد. سوپای پاکسازی لە ٢٣ی نیساندا ڕژایە ناو ئەستەنبووڵ و، دوای گرتنی سەربازگەکانی ڕامی و داود پاشا، وەزارەتی جەنگیشیان داگیرکرد. جێی گوتنە، پارێزەرو پاسەوانە تایبەتەکانی سوڵتان عەبدولحەمید، بەپێی فەرمانی ئەو، هیچ جۆرە بەرگرییەکیان نەکرد. سەربازگەی تاش و تابووری ڕاوچیی تەقیسم، لە ئەنجامی تۆپبارانێکی زۆردا، تەسلیم بوون. ئەم سوپایە، لە ماوەیەکی کورتدا، جڵەوی کاروباری ئەستەنبووڵی گرتە دەستی خۆی و ئیدارەی باری نائاساییی لە شاردا ڕاگەیاند. سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم لەسەر تەختی دەسەڵات لابراو، هەموو هێزی ئۆپۆزیسیۆن لەناوبران و، جارێکی تر هێز کەوتەوە دەستی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی.

بێلایەنــە هــەوڵی ســەقامگیرکردنی ئــازادیو پاراســتنی مەشــرووتییەت دەدەات. بــەڵام هــەر لــە یەکــەم ســاتەکانی هاتنیــدا، لــە خــوتو خۆڕاییو بــە هاندانی کۆمەڵــەی ئیتیحــادو تــەرەقی، کەوتــە خوێنڕشــتنو دەســتگیرکردنی مرۆڤە ئازادیخوازەکانو، بەو جۆرە بەڵێنەکانی خۆی بە جێنەهێنا. لەگەڵ ئەمەشــدا، وەك پــەلاماری خاچپەرســتەکانو لەڕێگــەی بەرژەوەندپەرســتیو تالانکاریی تایبــەت بــە هەنــدێك لایەنــەوە، بەپەلــە دەســتی بــە هێــرش وتالان کــرد. ئــەم قارەمانانــەی ئازادی، لــەماوەی چــەند ڕۆژێکــدا، بــەناوی (هەڵمــەتو پــەلاماری ســەر کۆنەپەرستی)یــەوە، لــە کۆشــکەکانی یلــدزەوە بگــرە تــا ماڵو جێگەی حەوانەوەی نوێنەرانو، تەنانەت ماڵی کۆمــەڵێك بێچارەو داماویش، هێرشیان کردە سەر هەموو جێگەیەك (!).

یــەك‌بەیــەك ســەریان لــە قوتابخانــەی هــەموو گەڕەکــەکان داو، بــە هــەزاران مامۆســتای بێچــارەیان گــرتو تەســلیمی دەســتەکانی "بــەکر ئاغا"یان کردنو، دواتریش زۆر بێبەزەییانــەو بە بــێدەنگی، هــەموویان خستنە نــاو زینــدانی مــەزارەکان. داخــۆ ئــەو کەســانەی کــە ئــەم هــەموو دڕندەییە ئەنجام دەدەن، دەبێ چ جۆرە ناسنامەیەکیان هەبێ ؟

لــە ڕواڵەتــدا، مەبەســتیان لــەم کردەوانــە پاراســتنی مەشــرووتییەتو ئــازادی بــوو، بــەڵام لەڕاســتیدا ئامــانجی ســەرەکی خۆشــکردنی ئــاگری گەنــدەڵیو خراپــەکاریی کۆمیتــە بــوو. ئــەو بوودەڵانــە بــە چ جــۆرە ڕێگەیەکی گڵاوو ستەمکارانە گەیشتنە ئامانجەکانیان ! هەرچەند بیری لێ دەکرێتەوە، ویژدانی مرۆڤ زیاتر دەلەرزێو تووشی نیگەرانی دەبێ. ئایا ئەم ئیدارەیــەی ئێستا لەبنەڕەتدا لەڕێگــەی ستەمو خیانــەتکاریو، بەتایبەت چەپەڵیی سەد ئەوەندە زیاترەوە لە حکوومەتی کۆن، خۆی

بەسەر خەڵكدا نەسەپاند ؟ ئایا ئەگەر بەڕاستی ئامانجی سوپای حەرەكەت پاراستنی ئازادیو مەشرووتییەت بوایە، ئەمڕۆ بەم ئاستە دەگەیشتین، یا بێهێز دەبووین ؟

دوورخستنەوەی زانایانو تەفروتوناكردنی پارتە مەشرووتییەتخوازەكانو لەناوبردنی مرۆڤە ئازادیخوازەكان، بە هەڵبەستنی درۆی كۆنەپەرستی بەدەمیانەوەو بە بەهانەی ڕاپەڕینی ٣١ی مارت، شتێكی شایستەی ئەو كەسانە نییە كە لەبەر ئازادی خۆیان بە دارو بەردا داوەو چاوەڕێی سوودو زیانیش دەكەن. بەڵكە بەپێچەوانەوە خەوشێكی گەورەیە. ئەم سوپای حەرەكەتە، خۆی لەبنەڕەتدا كەسانێكی سافو سادە بوون، بەداخەوە لەڕێگەی بیرو بۆچوونی پارێزگارییەوە خۆیان تووشی تاوانو خوێنڕشتن كردو، بەبێئەوەی هیچ ترسێكیان هەبێ كە مێژوو تاوانباریان دەكات، دەستی خۆیان وەشاند. ئەم تاریكاییو نەهامەتییەی ئێستا، ئەنجامێكی دڵتەزێنی ستەمو زۆردارییەكەی ئەوكاتەیە. هەر لەبەر ئەوەشە كە ئێستا وڵاتە عوسمانییە بێچارەكەمان نە ئازادیو نە مەشرووتییەتی تێدایە. ئێستا دەسەڵات بەدەست ئیدارەكانی باری نائاساییو ئارەزوو و ویستو، بەتایبەت زۆردارییەوەیە. ئاخۆ چی نەكرا، یا ئەوە چ شتێكە كە ئێستا ناكرێ ؟

ئەلبانییە بێچارەكان، كە بۆ پاراستنی ئازادی ڕژابوونە ئەستەنبووڵو، بە شێوەیەكی ئازاد چاویان بڕیبوە ژیان، دواتر سزای دڵتەزێنی كردەوەكانی خۆیان وەرگرتەوە. ئەو بێچارانە، دوای هەموو شتێك، جێگەو واری خۆیان لەدەست داو، تەنانەت گۆشەیەكیشیان بۆ

نەمايەوە. بەڵام ئەمڕۆ ئيتر هاوڵاتيە ئەلبانيەكانمان تێگەيشتوون ئەو بێڕەوشتانە بە چ شێوەيەك گەمەيان پێكردوون و، ناوەڕۆك و شەخسيەتی ئەوانەيان بەڕوونی بۆ دەركەوتووە. لە كۆتاييدا دەتوانين بڵێين، ئەنجامی ئەو هەموو ڕووداوە خوێناويە دڵتەزێن و جەرگسووتێنە سەيرانە، لەوە زياتر كە چەتەكانی كۆمەڵەی ئيتيحادو تەرەقی يان زيندوو كردەوەو وڵاتەكەمانيان بەرەو مەترسی ی نەمان و لەناوچوون برد، هيچ شتێكی تريان پێنەبوو. بێگومان پەيوەندييەك لەنێوان سەرەتاو كۆتاييدا هەيە. ئەو جۆرە سەرەتاو دەستپێكردنانە تاوان و خوێنيان تێدا بووە، بۆيە ئەمڕۆ ئەنجامی پڕ لە نەهامەتی و بێخێری و ئاژاوەگێڕی دەكەوێتە ڕوو. ئێستا هەمووشتێك، هەموولايەنێك و هەموو جێگەيەكيش شايەت و بەڵگەی ڕاستەقينەی ئەمەن.

ڕاستی ی حكوومەت و دەوڵەت و ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك و ڕاگەياندن، بە شێوەيەكی ئاشكرا، پەردەی لە ڕوو هەڵماڵراوە. تەنانەت تێڕوانينێكی سەرپێييش، دەتوانێ زۆر بەباشی ئاستی ئازاديەكانمان دياری بكات. ئێمە سەدان لەعنەت و نەفرينمان لەم كردەوانەی سوپای حەرەكەت كرد كە دەيان ڕووداوی ستەمكارانەيان لێ كەوتەوە، بە جۆرێك كە موچڕك دەخەنە گيانی مرۆڤەوە. مێژوو هيچ كاتێك ئەم خيانەتكاری و تاوانانە كە مەشرووتييەتەكەی عوسمانييان لەونابردو وەك پەڵەيەكی هەميشەيی بەسەر نامووسی نەتەوەييمانەوە ماونەتەوە، فەرامۆش ناكات.

## گرفتی سەربەستی

کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، لەڕێی پراکتیزەکردنی دووبارەی زوڵم و ستەمەکانی دنیای عوسمانی و، بەتایبەت دروستکردنی تراژیدیای ٣١ی مارت و ڕووداوەکانی ترەوە، بەتەواوەتی خۆی لە وڵاتی عوسمانیدا سەپاندو، ئیدی لەبەر ئەوەی مەیدانی بۆ چۆڵ بوو و ڕووبەڕووی هیچ نارەزایی‌یەك نەدەبوەوە، بەئاشکرا کاری بۆ بەدیهاتنی ئامانج و ئارەزووی بەرژەوەندپەرستانەی خۆی دەکردو، هەموو ناوەڕۆکێکی خۆی دەخستە مەیدان.

منیش، بە ڕەچاوکردنی ئەم بارودۆخە، بۆ پاراستنی مەشرووتییەت و، بە تایبەت بۆ ڕوونکردنەوەی مێشك و بیری خەڵك، بەرنامەی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکم لەگەڵ ئازادیخوازانی تردا داڕشت. ئەوکاتانە "مەولان زادە"[٣٩]ش لە میسرەوە هاتبوو بۆ پاریس. لەگەڵ ئەودا باسی

---

[٣٩] مەولان زادە ڕفعەت، یەکێك لە ڕۆژنامەنووسان و سیاسەتمەدارانی قۆناغی مەشرووتییەتی دووهەمە. لە ڕۆژنامەکانی "سەربەستی" و "حوقووقی عوموومییە"دا، وەك بەرپرس و نووسەر، کاری کردووە. لە کۆمەڵەو پارتەکانی وەك کۆمەڵەی "فیداکارانی میللەت"، "فیرقەی ئەحراری عوسمانی"، "پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی عوسمانی"، "دەستەی عەوامی ڕادیکاڵ– رادکال عوام فرقەسی"دا ئەندامێتی و بەڕێوەبەرێتیی کردووە. دوای ڕووداوەکانی ٣١ی مارت، لەلایەن بەڕێوەبەرێتیی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی‌یەوە، درایە دیوانی دادگای جەنگ و، بۆ ماوەی دە ساڵ دوورخرایەوە.

خەرجی‌ی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی "سەربەستی"[٤٠] مان کردو، پەیمانێکمان لەسەر ئەو بابەتە بەست. ئێمە لەم مەسەلەیەدا، بەرامبەر بە هەموو مرۆڤە بیرئازادەکانی قۆناغی ڕابردوو کە وا دیاربوو کاریان بۆ ئازادی‌و مەشرووتییەت کردووە، خاکیبوون‌و سادەیی‌ی خۆمان نواندو، ڕێگامان بۆ کردنەوە. هەر لەبەر ئەمەش، بۆ ئەو مەسەلەیە، سەربەخۆییەکی تەواومان بە مەولان زادە دابوو.

## پەیمان

ئەم پەیمانە، سەبارەت بە دەرکردن‌و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی سەربەستی، بەپێ‌ی ئەم مەرجانەی خوارەوە لەنێوان شەریف پاشای کوڕی خوالێخۆشبوو سەعید پاشای سەرۆکی شوورای دەوڵەتی پێشوو و مەولان زادە ڕفعەت بەگی خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی "سەربەستی"دا، لە دەرەوەی وڵاتی عوسمانی مۆرکراوە:

١. شەریف پاشا تا ئەوکاتەی بەناچاری لە دەرەوەی وڵاتی عوسمانی دەمێنێتەوە، بەڵێنی دەدات مانگانە بڕی (٢٥٠٠) فرانکی فەرەنسی بۆ

---

[٤٠] سەربەستی، ڕۆژنامەیەکە نێوان ساڵانی ١٩٠٨-١٩١٢ مەولان زادە ڕفعەت دەری‌دەکرد. ئەم ڕۆژنامەیە لە ڕیزی ئۆپۆزیسۆنداو لەگەڵ فیرقەی ئەحرارو دەستەی فیداکارانی میللەتدا دژی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ڕاوەستا. سەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیە حەسەن فەهمی بەگ بوو، کە چەند ڕۆژێك بەر لە ٣١ی مارت، بە دەستی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی کوژرا. ڕفعەتیش بەهۆی ڕووداوەکانی ٣١ی مارتەوە، بۆ ماوەی ١٠ ساڵ دوورخرایەوە. ڕۆژنامەکە، چەند ڕۆژێك دوای داخرانی، (ژمارەکانی ١٩٢-١٩٧)ی بەناوی "ئەهالی"یەوە دەرچوو. شایانی باسە، هەوڵدانی دەرکردنی ڕۆژنامەکە لە ئەورووپا، وەك پێشتر باس کرا، ئەنجامی نەبوو.

پێویستیەکانی ڕۆژنامە دابین بکات و، بەرامبەر بەمە، داوای تاقیکردنەوەو جێبەجێکردنی ئەم بەرنامانەی خوارەوە لە ڕۆژنامەکەدا دەکات.

٢. ڕۆژنامەی "سەربەستی" هەفتەی جارێك لە پاریس دەربچێ.

٣. پاراستنی هەمیشەیی ی مەشرووتییەت و ناساندنی بنەماکانی مەشرووتییەت بە خەڵك، ئەرکی ڕۆژنامەکە بن.

٤. ڕۆژنامەکە، داوای قەدەغەکردنی دەستتێوەردانی سەربازو سوپا لە کاروباری سیاسیدا بکات و، لەوبارەیەوە خەڵك ئاگادار بکاتەوە.

٥. ڕۆژنامە، دەبێ پێکهێنانی کۆمەڵەی نهێنی و دەستتێوەرنەدانی ئەم جۆرە کۆمەڵانە لە کاروباری حکوومەتدا بپارێزێ.

٦. پێویستی و چاکیی بوونی پارتە سیاسییەکان، بە مەرجی دەستوەرنەدانیان لە کاروباری حکوومەتدا، بۆ خەڵك شی بکاتەوە.

٧. لەبەر ئەوەی دەستوەردراوەتە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك و فێڵی تێدا کراوە، داوای نەمانی ئەم ئەنجومەنەی ئێستا و سازکردنی هەڵبژاردنێکی تر بکات.

٨. هەروەها پێویستە داوا بکات سەربازو سوپا، بەپێی یاساکانی ئەورووپا، مافی هەڵبژاردنیان نەبێ.

٩. دەبێ لە یاساییکردنی وازهێنانی کەسێکی سوپایی لە پۆستەکەی، لە کاتی هەڵبژێردراندا بۆ نوێنەرایەتی پارلەمان، بدوێ.

١٠. دەبێ بەرامبەر بەو ماف و دەسەڵاتەی کە مەشرووتییەت بە بەڕێوەبەرێکی دەدات، مافی پادشایەتیش بپارێزرێ.

١١. دەبێ کۆمەکی پارەو نووسینەکانی کەسێك بۆ ڕۆژنامە کە گومانی بێناموسی ی لێ دەکرێ، وەرنەگیردرێن.

١٢. پێویسته هەردوولا ئاگایان لە بڕی ئەو پارانە بێ کە وەك پارمەتی لە دەرەوە دێت.

هەردوولا سوێند بە شەرەفی خۆیان دەخۆن کە مەرجەکانی ئەم پەیماننامەیە بەجێبهێنن و، دوای مۆرکرانی، پێکەوە دەست بەکار دەکەن.

پاریس ٢٢ی تەمووزی ١٩٠٩

شەریف

بەپێی ئەو مەرجانەی کە لەسەرەوە باسیان کراوە، بڕی پارەی داواکراو درا بە مەولان زادە. ئیتر لەوەبەدوا خەرجی بەکرێگرتنی خانوویەك و پێویستیەکانی نیشەجێبوون و نەخۆشی و قەرزو گەشتەکان، لە خەرجیەکانی تر زیاتر بوون.

مەولان زادە، ٢٣ی ئابی١٩٠٩ لە نامەیەکی خۆیدا، دوای هەندێك خوێندنەوەی خۆی بۆ ڕووداوەکان، دێتە سەر باسی ئەمانە: ((بڕی ئەو پارەیەی کە پێمان درابوو، لەبەر گواستنەوەی ئاپارتمان و خەرجی هوتێل و ئەو کۆمەکانەی کە دراونەتە هەندێك کەس کەوا گومان لە هاوڕێیەتییان دەکرێ، تەولو بوو (!!!) لەبەر ئەمەش، بۆ پاراستنی ئابڕووی ڕۆژنامەکەو، بۆ ئەوەی بتوانین ژمارەی پێنجەمی ڕۆژنامەکە دەربکەین، تکایە تەواوی یا بەشێکی بڕی ئەو پارەیەی کە بڕیارە لە سەرەتای مانگی ئەیلوولدا (٢٣ی ئاب) بدرێ، بەبێ درەنگخستن بۆمان بنێرن (!!!) هەروەها داواکارم (١٠٠) فرانکی پاشماوەی خەرجیەکانی مانگی ئاب بخەنە سەر ئەو بڕە کە بە گەیشتنی نامەکە بۆمانی دەنێرن)).

شایانی باسە، ناوبراو لە دوا دێڕەکانی نامەکەیدا، ئەمانەی خوارەوە دەخاتە بەرچاو: ((هەمووکاتێك چاوەڕوانی زیادبوونی بەخشندەیی بەڕێزتان دەکەین‌و، تکام وایە، بۆ ئەوەی کاروبارەکانمان دوانەکەون، داخوازیەکانمان بەجێ‌بهێنن. چاوەڕوانی بەڕێزتان دەکەین، دەستوور...)).

ناوبراو لە نامەیەکی تریدا کە ۲۱ی تشرینی یەکەمی ۱۹۰۹ نووسیویە، دوای ئەوەی دێتە سەر باسی ئەو قەرزە کە لە ئەنجامی گەشتەکەی پاریسەوە بۆ ئەتینا لە "مەکی بەگ"ی وەرگرتووەو، ئەو خەرجیانەش کە بۆ سێ هاوڕێی خۆی کردوون کە هێشتا بەتەواوی شارەزای پاریس نەبوون‌و، دوای ئەوەی چەندین هۆی تریش دەهێنێتە بەر باس، وەها بەردەوام دەبێ: ((بەکورتی، ئێستا بودجەکەمان ۷۰۰ فرانکە(!!!)و خەرجیەکانی پێشتر (!) سەد یا دووسەد فرانکێك ماوەتەوە (!!!) بەکورتی کەمی بودجە هاتوەتە پێشەوە. بەرامبەر بەمە، لەلایەکەوە بە هیوای ئەوەی کە یارمەتییەکمان بۆ بێ، چاوەڕوان ماینەوە (!) بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، من دەستم کرد بە دانانی ڕێ‌وشوێنی ئیداریی پێویست. بەداخەوە نە کەس یارمەتیی دەداین، نە من بۆ قۆنتەرات‌و بەڵێندەرایەتی سەرم لە هیچ لایەنێك دەدا. بیرم لە بەکارهێنانی بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ ژیانی خۆم کردەوە. خۆی ئەو بڕی پارە تەرخانکراوە، بەزۆری بەشی خەرجیی ژیانی دەکرد، بەڵام کاتێك سەد فرانکم لێ کەم کردەوە [و: بۆ ڕۆژنامە] زیاتر تووشی گیروگرفتی کردم.

لەبەر ئەوەی کاتی خۆی لەژێر ئەشکەنجەدا ئازاری زۆرم بینیبوو، لە باری تەندروستیشەوە وەزعێکی باشم نەبوو. پێویست بوو تەگبیرو

ڕێوشوێنی تەندروستیش دابنێم. هەموو ئەمانەش، پێویستییان بە پارە هەیە. هەروەها پێویست بوو بە گۆڕان و ساردبوونی هەوا، هەندێك جل و پۆشاکی گەرمیش بکڕم. ئەگەر چەندین جاریش سەرنجی ئەوانم سەبارەت بەم مەسەلەیە ڕاکێشابێ (!) بەڵام دوایی تێگەیشتم، ئەم خەرجییە زیادەی ئەوان قازانج و سوودی ئێمەی تێدا نییە (!!) لەدواییدا قەناعەتم پەیدا کرد کە بەوەی هەیە ئیدارە بکەین. بەڵام دواتر هەر نەخۆش کەوتم.

لەبەر ئەوەی کەلوپەلی ژووری نوستن و تەختەکان (تەختی نوستن) زۆر تۆکمە نەبوون و بەرگەی سەرمایان نەدەگرت، بەناچاری دەستێکی تری سێ کەسیم (بۆ خۆمان و خزمەتکارێك) کڕی. (بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دیسان دەکرێ هەر بەمانەشەوە ئیدارە بکەین). سەرەڕای ئەمانە، سێسەدو پەنجا فرانکی تریشم خەرج کرد. هەموو پسووڵەکانی ئەمانەم لەلایە (!!!) بەم شێوەیە، ئیتر بودجەکەمان زیاتر ڕووی لە کەمی کرد (یا ئەمە چ ئارامگرتن و قەناعەتکردنێکە) خۆ هەموو کەلوپەلەکانیش، هێشتا هەروا ماونەتەوە. بەڵام پێویستیمان بە پارەی ئامادە هەیە. (بەم شێوەیە!).

لەبەر ئەوە من ڕاستگۆیانە هاوکاری لەگەڵ هەمووکەسێك (نەك تەنیا ئەو کەسانە)دا بە دەکەم. بۆ ئەوەی کەمی ی بودجەکە (بەوشێوەیەی کە دیاریکراوە) پڕبکرێتەوە، تەنیا یەك ڕێگەچارە شك دەبەم، ئەویش ئەوەبوو کە نامەیەکم نووسی بۆ دایکم لە ئەستەنبوول و داوام لێ کرد ئەو خانوەی وا نیو دانگی بە میراتی بۆ من ماوەتەوە، بیخاتە بارمتەو پارەکەیم بۆ بنێرێ.

من دایکی خۆم باش دەناسم، هیوام وایە، ئەو ژنە بەجەرگ‌و ئازایە، هەرچۆنێك بێ لەماوەی (٢٠-٢٥) ڕۆژدا پارەکەم بۆ بنێریێ‌و، بەو جۆرە کەمی‌ی بودجەکە پڕببێتەوە)).

ناوبراو، لە درێژەی نامەکەیدا، وەها دەڵێ: ((بەڵام تا ئەوکاتە، بەهۆی ئەو هەلومەرجەوە کە هاتبوە پێشەوەو، لەبەر ئەوەی نەدەتوانرا ڕۆژنامەکە بەبێ‌وەستان‌و دوابەدوای‌یەك دەربکەین، (خۆی لە خۆیدا ئەو هەلومەرجە دەرکردنی ڕۆژنامەکە شیاو نەبوو)، ئەو هەفتەیە دەرکردنی ڕۆژنامەکەمان دواخست (یانی بەپێچەوانەی پەیمانەکەوە نەجوولاینەوە).

لەبەر نەبوونی پارە، نەمتوانیبوو ژمارە یانزەی ڕۆژنامەکە دەربکەم. دەبێ بەناچارییەکی پڕ لە ئازارەوە چاوەڕوانی گەیشتنی پارە لە ئەستەنبووڵەوە بکەم، تا ژمارە دوانزەی ڕۆژنامەکە دەربکەم (ئەگەر بە شێوەیەکی کراوەتر بدوێم، پێم وایە ئێوەش هەستتان بەو ناچارییە دڵتەزێنە کردووە!). بە کورتی، ئەوانەی وا باسم کردن، ناوەڕۆك‌و چۆنیەتی ڕووداوەکان بوون.

(لەبەر ئەمە درەنگ کەوتنی گەیشتنی پارە، دەبێ بەهۆی جیابوونەوەمان). ئێستا ئەگەر بڕی هەزار فڕانکمان بەڕێگەی حەواڵەی تەلگرافییەوە بۆ بنێرن، زۆرباش دەبێ. شایانی گوتنە، دەتوانرێ بڕی ئەم پارەیە، لە بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ مانگی داهاتوو هەڵبگیرێ. بەم جۆرە ڕۆژنامەکەش بە شێوەیەکی بەردەوام دەردەچێ‌و، سەرنجی کەس ڕاناکێشێ. هەمووکاتێك چاوەڕوانی متمانەو سەرنج‌و بایەخ‌پێدانی نەجیبانەی ئێوەم بەرامبەر بە خۆم)).

ماوەیەك پاریسم بەجێهێشت و، ڕۆیشتم بۆ کەنارەکانی دەریا لە (هەنداى). مەولان زادە لە تەلگرافێکدا، بەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەك، داوای هەزار فرانکی لێ کردم. منیش بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی ئەم تەلگرافەم دایەوە: ((لەبەر ئەوەی کێشەیەکی گرنگی وەها پێویستیی بە گفتوگۆو ڕاوێژێکی زیاتر هەیە، تکام وایە تا گەڕانەوەم لەماوەی چەند ڕۆژێکی تردا، چاوەڕوان بمێننەوە–شەریف)).

بەرامبەر بەم وەڵامەی من، دووبارە بەڕێگەی تەلگرافەوە شتێکی تری بۆ ناردم و، باسی تێدا بۆ کردم کە بەپەلە پێویستیی بەو پارەیە هەیە.

منیش دووبارە، لەڕێگەی تەلگرافێکەوە، بۆم ورد کردەوە کە تا ڕوونکردنەوەی پێویستی لێ وەرنەگرم و هاوڕا نەبم لە هەر کارێك کە دەکرێ، هیچ شتێك ناکەم: ((مەولان زادە ئەفەندی، تکایە بەهۆی نامەوە ڕوونکردنەوەی پێویستمان بۆ بنێرن–شەریف)).

دوابەدوای ئەمە، بۆ ئەوەی گوزارشت بکات لە دڵگرانیی خۆی بەرامبەر بە ئێمە، نامەیەکی بۆ کاتبی تایبەتی من ناردبوو:

((ئاغای گەورەو ئازیزم"

ئێوە لە من باشتر ئاگادارن کە هەموو کاروبارە هاوبەشە سیاسیی و ئابووریەکان و.. هتد، هەمووی لەسەر بنەمای ئاسایش و متمانە بەڕێوە دەچن.

بەناچاری من هەندێك بەندی پەیمانی مۆرکراو لەگەڵ حەزرەتی پاشادا* و، هەندێکی تریش حەزرەتی پاشا خۆی جێبەجێ و پێڕەوی نەکردوون. بەمانە، هەندێك ئاستەنگی دەرەکیش زیاد بوون. ئەوسا ئیتر بێبڕوایییەك لەنێوان هەردوولادا پەیدابوو. لەبەر ئەو هەستی

* مەبەست شەریف پاشایە.

ڕێزو حورمەتەی کە من بەرامبەر بە حەزرەتی پاشا هەمە، ئەم شتەم پێ باش نییەو لێی دڵگرانم. لەبەر ئەوە، ڕێکخستنەوەو داڕشتنەوەی سەرلەنوێی پەیمانەکە بۆ بەڕێوەچوونی کارەکان، پێویستییەکی گرنگن.

ڕاییکردنی حیسابی ڕابردوو، بەپێی فەرمانی بەڕێزتان لە نامەی پێشوودا، شتێکی پێویستە. حیسابی ڕابردوو بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

هەموو ئەو بڕی پارەی ئاقچە** یەی کە حەزرەتی پاشا داویە بە من، بەگشتی، بەشی دەرکردنی (١٣) ژمارەی ڕۆژنامەکەی کردووە. پارەی (١٠) ژمارە لەمانە، دراوە بە چاپخانە. پێویستە بوترێ، ژمارەی (١٣) هێشتا دەرنەچوەو، پارەی ئەو دوو ژمارەیەی تریش، بەپێی ئاگادارای و مۆڵەتی حەزرەتی پاشاخۆی، بۆ هەندێك وردە پێویستی و چەند لاپەڕەیەکی تر کە چاپم کردوون، وەك قەرزی چاپخانە لەلامان ماوەتەوە.

وەهام بیستووە کە حەزرەتی پاشا دوای نامەکەی من کە ڕوونکردنەوەی پێویستی تێدا هەبوە، پارەی ژمارەی (١٢)ی ڕۆژنامەکەی، بەناوی خودی بەڕێزو گەورەیانەوە داوە. پارەی ژمارەی یانزەی ڕۆژنامەکەش، ئەگەرچی لەنێو بەڵگەو دەفتەری قەرزەکانی حەزرەتی پاشادا نووسرابوو، بەڕێزیان پەسندی نەکرووەو، بە لێزانی و تێکەیشتوویی خۆیانەوە، قەرزەکە بە ئاگادارییەك دووبارە کەوتەوە ئەستۆی من. شایانی گوتنە، لەوبارەیەوە تووشی شەرمەزارییەکی گەورە بووم. بەم شێوەیە، ئێستا نزیکەی (٦٠٠) فرانك قەرزاری کابرای خاوەنی چاپخانە. ئەمەش بەگوێرەی پەیماننامەکە وا دەکات، ئەم قەرزەو پارەی ژمارەی (١٣) کە هەمووی دەکاتە (١٦٠٠) فرانك، لەلای حەزرەتی پاشا وا بێتە بەرچاو کە بودجەکە کەمەو نەماوە.

---

** جۆرە پارەیەکی عوسمانیی بەکارهێنراوی سەردەمەکە بووە.

بەم جۆرە، ئەمە هەمووی باری ڕاستەقینەی چۆنیەتی مەسەلەکان بوو کە پێشکەشی حەزرەتی پاشای دەکەم. بەڵام ڕاستیەکەی لەبەر ئەوەی لە نامەکانی پێشتردا باسی ئەمانەم بە هەموو وردەکاریەکانەوە کردبوو، دووبارەکردنەوەیان بە شتێکی پێویست نازانم. بەگوێرەی پەیماننامەکە، من قەرزاری حەزرەتی پاشا "شەریف پاشا"و کابرای خاوەن چاپخانەشم. بەڵام ئەگەر پارەی کرێی خانووی لێ کەم بکرێتەوە، کە پێشتر حەزرەتی پاشا بەڵێنی دابوو بیگرێتە ئەستۆی خۆیو، دواتر خستوویەتیە سەر بودجەی گشتیو، ئەگەر سێسەد فرانکی پارەی لاپەڕە چاپکراوەکانیشی لێ دابشکێنرێ کە بەڕەزامەندیی پاشا خۆی چاپ کراون، ئەوا کۆی هەموو قەرزەکە، لەگەڵ پارەی هەردوو ژمارە (١٢)و (١١)دا، خۆی لە هەشتسەد فرانك دەدات. بە واتایەکی تر، بودجەکەمان بڕی هەشتەسەد فرانك کورتی هێناوە (بڕی حەوت سەد فرانکی ئەمەش، بۆ دانەوەی قەرزەکەی ئەتینا خەرج کراوە، یانی بە شێوەیەکی ڕاستتر، بودجەکەمان تەنها سەد فرانکی کەمیی هەیە). ئەگەر حەزرەتی پاشا بیانەوێ، دەتوانم سەبارەت بەو سەد فرانکەش بەڵگەیەکی ڕەسمیی قەرزیان بۆ مۆر بکەمو، کاتێك، وەك پێشتر باسم کردبوو، پارەکەم لە ئەستەنبووڵەوە گەیشت، پێیان دەدەمەوە. ئەگەر هاتو پارەکەم نەگەیشت، ئەوا ئەمە دەبێ بە قەرزێك کە پێویستە لە یەکەم هەلی گونجاودا بدرێتەوە.

ئێستاش لەبەر ئەوەی کە سەری مانگە، ئەگەر وردەکاریی شاراوەی حیسابەکانی ڕابردووتان لاپەسند بێ، پێویستە بەڕێزتان بایەخ بەم داواکاریە پچووکەی بەندە بدەن بۆ بەردەوامیی

کاروبارەکـان، بـە مـەرجێك پەیوەنـدیی ڕەسمیمـان لەگـەڵ حـەزرەتی پاشادا هـەر لـە سنووری کاروباری ڕۆژنامەکـەدا بمێنێتـەوە. پێویـستە حـەزرەتی پاشـا ئـەم حیـسابەی خـوارەوە، کـە لەگـەڵ حیـسابەکەی ڕابردوودا هیچ جیاوازییەکی نییە، ئیمزا بکەن، بۆ درێژەپێدانی کارو، بۆ ئەوەی کە هەستی گەورەیی‌ی دەروونم بریندار نەبێ و، کاروبارەکان بە خۆشی و ئاسوودەیی بەڕێوە ببەم.

حیساب:

- فڕانك

١٦٠٠ فڕانـك وەك کـرێی مانگێـك بـۆ دەرکردنـی چـوار ژمارەی ڕۆژنامـە. بـۆ (٤٠ تـۆپ لاپـەڕەی کاغەزو پێداویـستی تـرو، هەروەها بۆ خەرجی چاپکردنی لاپەڕەی جیاواز کە هـەر دانەیـەکی بـە ٤٠ فڕانـك چـاپ دەکـرێ. جـێی قـسەیە، خـەرجـی‌ی ١٦٠ پۆستەی گشتی و پۆستەی تایبەت، هەریەکە بە ٤٠ فڕانکە).

٦٠٠ فـڕانکیش بـۆ دابینکردنـی خـەرجـی‌ی ژیـان و کـرێ و نووسەرو کرێ‌خانوو.

– کۆی گشتی دەکاتە ٢٤٠٠ فڕانك.

تا ئەوکاتـەی داوای بەشداریم لـە کاروبـاری کۆمەڵـەدا لـێ دەکـرێ و، لەم بارەیەشەوە داوای دەکرێ ڕاستەوخۆ یارمەتـی‌ی هـیچ لایـەن یـاخود کەسـێکی تـر وەرنـەگرم (تەنانـەت ئەگـەر بـڕە پارەیـەکی زۆریـش بـێ)، پێویستە داواکاریەکانمان، کە هەندێك جار دێنـە پێشەوە، بە زووتـرین کات جێبەجێ بکرێن و، دواتر داوای حیساب بکرێ و، ئەمەش بە مافێك

دابنرێ، چونکه له هەندێك بارودۆخدا دەرفەتی ڕوونکردنەوەمان نابێ. درەنگ خستنی کاروبارەکانیش تا بەرچاوخستنی ڕوونکردنەوە، دەبێ بەهۆی زەرەرو زیانێکی گەورەتر.

براگیان، تکایە بە شێوەیەکی شایستەو دروست ئەم شتانە بە حەزرەتی پاشا ڕابگەیەنن و، دواتریش بڕیاری بەڕێزیان و چۆنیەتی هەڵس وکەوتی من بەشێوەیەکی نووسراو دیاری بکەن و بۆم بنێرن. ئەفەندم، هەمووکاتێك بە هیوای سەرنج و بایەخ پێدانی برایانەی زیاتری ئێوەم)).

مەولان زادە ڕفعەت

سەرەتا کاتێك مرۆڤ ئەم نامەیەی مەولان زادە دەخاتە پێش چاو، ڕفعەت ئەوەی بۆ دەرناکەوێ کە کام لایەن بەڵێنەکانی خۆی بەجێنەهێناوە ؟

بە خوێندنەوەی نامەکانی مەولان زادە، بە ئاشکرا ڕوون دەبێتەوە کێ لەپێشدا ئەو پەیمانەی شکاندووە کە خۆی شێوەی (پەیمانی شەرەفمەندانە) ناویی هێناوە.

لە هەموو ئەمانەش بەدەر، لەماوەی چەند مانگێکدا بە ڕوونی ئەوە بۆ خەڵك دەرکەوتووە کە مەولان زادە کەسێکە زۆر حەز لە ڕابواردن و خۆشگوزەرانیی خۆی دەکات. ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە داواکارییە بێکۆتاییەکانی بەو ئەندازەیەی کە باسی کردوون، پێویست نەبوون. لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، لەکاتێکدا زۆر پێویستیمان پێی هەبوو، لەناکاو ڕۆی بۆ سەفەرو گەشت وگوزارو، بەو جۆرەش بوو بە مایەی بێزاریی هەموولایەك. تازەبەتازە لە نامەیەکدا کە پڕە لە شتی

پڕوپاگانتـه، لـەوە دەدوێ کـە لـەژێر سـایەی پارێزگـاریی کۆمەڵـەی "ئیتیحادو تەرەقی"دایەو، ئەوەشی لێ زیاد دەکات کە کاتی خۆی دژی بە (کۆنە برایان) ڕاوەستاوە.

دواتـر لـەپڕ هەڵـگەڕایەوەو، ئـەمجارە بـە شـانوباڵی خـاوەنو ئاغـاو ئەفەندیە تازەکانی خۆیدا هەڵیدایەوەو، بەو جۆرەش خۆی سووك کرد.

دوژمنـانی کـۆنو تازەمـان کـە بـەردەوام ویـستوویانە خۆیـان بـە کەسـانی ڕەوشـتبـەرز لەقەڵـەم بـدەنو، هەمیـشە هـەوڵیان داوە کـارو چالاکیەکانمان، لـەپێناوی نەتـەوەو مەشـرووتییەتدا، بـە شـێوەی تـر نیشان بدەنو، بە ڕەنگی جیاوازترەوە بیخەنـە بـەر دیـدەی خـەڵك. تـەنیا بۆ جارێکیش لێبوردەییو ئازایەتیی ئەوەیان نـەبوو، بـەپێی ویـژدانو باوەڕی خۆیان، بڕواننە کارو کردارەکانی ئێمە.

ئێـستا خەفـەت بـەوە دەخـۆم کـە کـاتی خـۆی، لەبـەر پێویـستی، سووکایەتیمان بە خۆمـان کـردووەو لەوانە دوواوین، چونکە ئەمانـە لـە جـۆری ئـەو مرۆڤانـەن کـە بێڕەوشـتنو هـیچ کەسـێتییەکی ئـەوتۆیان نییـەو، لـە بـاری ماددیو مەعنەویـشەوە، لـە زەلکـاوی بوودەڵـەییو داماویـدا دەژیـن. ئێمـە تـەنیا لەبـەر ئـەوەی بتـوانین، هەنـدێك ڕاسـتی ئاشـکرا بکـەینو بیخەینـە ڕوو، باسـی ئەوانـەمان کـرد، ئـەگینا هـیچ شتێکی تر لەئارادا نییە.

# بەشی سێهەم

## بەرەو مەشرووتییەت

دوای ئەوەی کارە نابەجێو مایەی بێزاریەکانی مەولان زادە، بەو شێوەیەی کە باسم کردن، کۆتاییان پێهات، بڕیارم دا، بۆ درێژەپێدانی ڕچەشکێنیەکەی خۆم، ڕاستەوخۆ بەناوی ولاتی عوسمانیو نیشتمانەوە کاربکەم. بۆ ئەو مەبەستە، دەستم بە بڵاوکردنەوەی مەشرووتییەت کردو، بەو جۆرە خۆم خستە ناو مەیدانی کێشمەکێشەکان. شایانی باسە، هەر لەگەڵ ئەمەدا، دوژمنانیشم بە چەکی فێڵو درۆو تۆمەت هەڵبەستن، بە هەموو هێزێکی خۆیانەوە هێرشیان کردە سەرم. جاران بە شێوەیەکی شاراوە دژایەتییان دەکردم، بەڵام ئەمجارە ئیتر گەیشتنە ئەو ئاستەی کە بە ئاشکرا بکەونە دژایەتیمو، زۆر نامرۆڤانە وەك مار خۆیان بۆ پێوەدانم ئامادە بکەن. جاران بە (ولاتپارێزی گەورەو هێژا) (نەجیبزادەی ئازادیخواز) (گەورە پیاوی بەرپرسی دەوڵەتی عوسمانی) ناویان دەهێنایین. بەڵام هەر کە، بە تێپەڕینی کات، ماف ڕەوای خۆم بۆ دژایەتیکردنو پاراستنی بەرژەوەندی خەڵك بەکارهێناو، ئازادانە بیرو بۆچوونی خۆم دەربڕی، ئیتر ئەو کەسو قەڵەمانەی کە هەمیشە

قسەیان لەسەر تایبەتمەندییە چاك و هەڵبژێردراوە دوانەهاتوەکانی من بوو، کوتوپڕ بەپێچەوانەوە دەستیان کرد بە تۆمەتبارکردن و پڕوپاگەندەی گڵاو دژ بە ئێمە. لەساتێکدا ئێمەیان کرد بە کۆنەپەرست و هەواڵگرو سیخوڕو، بە کورتی کردینیان بە هەمووشتێك. سەرەڕای ئەم هەموو کینەو نەفرەتانە، کمەوتنە زماندرێژی بەرامبەر بە ناموس و شتە پیرۆزەکانیشمان. کورت و پەتی، ئێمەیان کرد بە خاوەنی هەموو تڕۆیی و سووکی و ڕەوشتخراپیەکی ناو دنیای مرۆڤایەتی.

ئەگەر ئێمەش لە ئاستی ویست و داخوازی و بۆچوونی بەرژەوەندپەرستانەی کۆمەڵەی سووك و ناڕەسەنی "ئیتیحادو تەرەقی"دا بێدەنگ بماینایەوە، یا پێبەپێی ئەوانە هەڵس وکەوتمان بکردایە، ئێستا ئێمەش دەبووینە یەکێك لەو پیاوانەی کە بە گەورەیی و ماقووڵی دەناسرێن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە زمانێکی نەرمی ڕەخنەمان بەگشتی بەرامبەر بە پارتی بەدخوویی و خراپەکاری بەکارهێنا، بۆ پاراستنی ماف ڕاستەقینەی خەڵك، یەکسەر بووین بە خیانەتکاری نیشتمان و، بە تایبەت بە خیانەتکردوو لە مەشرووتییەت دانراین.

ئەگەر ئەو کەسانەی کە کاتی خۆی یا سەردەمی حکوومەتی پێشوو بڕوایان بە ئێمەو هەستی نیشتمانپەروەریمان هەبوو و، پەنایان بۆ بیرو بۆچوونەکانی ئێمە دەبرد بۆ کێشەی دادو ئازادی، لەبەر پاکی و دروستی و چاکییەکانمان، ئانکوڵێرییان نەکردایەو، بەتایبەت کەمێك شەرمیان لە خەڵك بکردایەو نەکەوتنایەتە ناو ئەو هەموو گڵاوی و سووکایەتییە، سەرەڕای بێمێشکی و نەزانی، دەیانتوانی نیشانی بدەن کە، با تۆزێکیش بێ، دیسان

هەر ویژدان و دادیان لەلا ماوە. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەمانە ئەوەندە بێشەرم بوون، توانییان تۆمەتی هەواڵگەییێنی و سیخوڕی و کۆنەپەرستی و بێدینی بخەنە پاڵ کەسێکی وەك من، کە لە هەموو ژیانیدا بە شێوەیەکی نیشتمانپەروەرانە خزمەتی گەلەکەیی کردووە.

## سیخوڕی ئێمە

سەرەتا نەمدەویست باسی (سیخوڕان) بکەم، کە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بە مەبەستی هەڕەشەکردن و ناوزڕاندن و تۆڵەسەندنەوە، لەکاتێکدا هێنابوویە بەر باسی ڕۆژانە.

لەلایەکەوە، دوژمنە ناسراوەکانی من دەرهەق بەو کەسانە کە لەگەڵ بەرژەوەندیاندا ناگونجێن، بەتایبەت کەسێکی وەك من کە بەرامبەر بە تاوان و ستەمەکانی ئەوان بە ئاشکرا ناڕەزایی‌ی خۆم دەردەبڕم، زۆر بێشەرمانەو بە هەستی پڕ لە کینەو تۆڵەسەندنەوەوە، هەموو ڕۆژێك دەست بە تاوانبارکردن و فرت‌وفێڵ دەکەن. بەڵام لەلایەکی ترەوە، خەڵکی عوسمانی، بە گەورەیی و هێمنی‌ی خۆیەوە، بە چاوی نەفرەتەوە دەڕوانێتە ئەم پڕوپاگاندانەو درۆو دەلەسانە. منیش لەبەر ئەمانە ئەم شتە هەڵبەستراوانەم بەشیاوی ئەوە نەدەزانی قسەیان لەسەر بکەم. لەگەڵ ئەمەشدا، بە مەبەستی هەم ڕوونکردنەوەو خستنە ڕووی شەخسیەتی ئەم مرۆڤە پیس و هەڕەشەکەرانە کە مەسەلەی سیخوڕی وەك کارتێك بەرامبەر بە کەسانی نەیار بەکاردەهێنن و، هەم پاراستنی شەخسیەتی خۆم، لە نووسینەکانمدا هەوڵی ڕوونکردنەوەو ئاگادارکردنەوەی بیرو زەینەکانم دابوو لەمانە. هەر لەبەر ئەمە، لێرەدا تەنیا چەند قسەیەك دەهێنمەوە.

بەشێك لەم جۆرە شەخسیەتە بێدڵروبارانەی وەك ئەحمەد ڕەزا بەگو هاوڕێکانی کە دەسەڵاتیان تەنیا بەسەر هەندێك بێچارەی سووكو داماودا دەشکێ، هەتا دوێنێ بوو، یانی تا ڕابردوویەکی نزیك، شانازییان بە دۆستایەتیی ئێمەوە دەکردو یارمەتیەکانی ئێمەیان بە گەورەییو ڕەوشتبەرزی نواندن لەقەڵەم دەدا. کەچی ئەمڕۆ هەموو یاساکانی دۆستایەتیو برایەتییان خستوەتە لاوە، بە پێشێلکردنی مافە ڕەواکانی هاوڵاتیبوون، ئەم تۆمەتی (سیخوڕی)ـەیان خستە پاڵ ئێمەو، هیچ شەرمێکیان لە خۆیان نەکرد.

ئەگەر دوژمنانی من تۆزێك ویژدانیان هەبوایە، بە ڕێگەو شێوازی ڕەوای یاسایی مامەڵەیان لەگەڵ هاوڵاتیەکدا دەکرد کە پەردەی لەسەر ڕووی ڕاستی خراپەو گلاویەکانیان هەموو ڕۆژێکیان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتو خۆشگوزەرانیو ڕابواردن لادا‌وە. هەروەها ئەگەر کەمێك بە ئینساف بوونایە، بەبێ ئەوەی ڕەوشتی گفتوگۆ بشێوێنن، لایەنی هەڵەی لافوگەزافەکانی ئەو هاوڵاتیەیان نیشان دەدا.

ئەو تاوانی (سیخوڕی)یەی کە خستوویانە پاڵ من، دەتوانرێ ئەوەی پێ دەربخرێ کە ئەم بێچارە بێمێشکانە کە بە باسوخواسی مەشرووتییەت گوێی جیهانیان کەڕ کردووە، کاتێك تەنگاو دەبنو ناتوانن خۆیان بپارێزن، یەکسەر پەنا دەبەنە بەر شێوازی نایاساییو ناڕەوای بەرەنگاربوونەوە[41]. لەکاتێکدا گەورەپیاوانی کۆمەڵەی

---

[41] ڕۆژنامەی "طەنین" کە ئۆرگانی ڕەسمیی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بوو، ڕۆژانی ١٢ تا ١٦ی ١٣٢٥، هەندێك ڕاپۆرتو هەواڵی بڵاوکردوەتەوە، گوایە ئەمانە ئەو ڕاپۆرتانەن کە شەریف پاشا بە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمی داون.

ئیتیحـادو تـەرەقـی ی ئالابەدەسـتانی قۆنـاغی ڕابـردووی دەوڵـەتی عوسمانی، زانییـان هەڕەشـەو تاوانبـارکردنی ئـەم و ئـەو بـە (سیخوڕی) هیـچ واتایـەکی نـابێ" لەکاتێکـدا کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تـەرەقی کەسـانی وەك مـەلا نەجمـەدین[٤٢] و حـەقی پاشـا[٤٣] و مـەحموود شـەوکەت

---

[٤٢] ئیبراهیم حەقی پاشا، سالی ١٨٦٢ لە ئەستەنبوول لەدایك بووەو، سالی ١٩١٨ لە بەرلین مردووە. یەکێکە لەو دوایین کەسانە کە سەرۆکایەتی ی ئەنجومەنی وەزیرانی حکوومەتی عوسمانییان کردووە. کوڕی ڕەمزی ئەفەندی ی سەرۆکی مەجلیسی شەهرئەمانەتی (شارەوانی) بووە. خوێندنی خۆی لە مەکتەبە حەربییەی بەشکتاش تەواو کردووە. مەکتەبی زانستی ئیدارەی سیاسیی بە پلەی یەکەم بڕیوە (١٩٠٨). بە وەزیفەیەکی کاتی ڕەوانەی ئیتالیا، یۆنان و ئەمریکا کراوە. لەکاتێکدا لە کۆشکدا کاری وەرگێڕانی ڕادەپەڕاند، لە کولێژی یاساشدا وانەی یاسای بەڕێوەبەرێتی و یاسای دەوڵەتانی دەگوتەوە. دوای ڕاگەیەندرانی مەشرووتییەتی دووهەم، پۆستی وەزارەتی زانست و وەزارەتی ناوخۆی وەرگرت، کاتێك وەزیفەی باڵوێزی ڕۆمای دەبینی، لەباتی حوسێن حیلمی پاشا، کرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران (سەدری ئەعزەم) (١٩١٠). دواتر سالی ١٩١٦ لە بەرلین کە وەك باڵوێز لەوێ بوو، ژیانی خۆی لەدەست دا. هەندێك بەرهەمی بە ناوەکانی: مێژووی یاسای دەوڵەتان، یاسای بەڕێوەبەرێتی (دوو بەرگ)، یاسای دەوڵەت (بە شێوەیەکی فراوان)، پێشەکی ی زانستی یاسا، کورتەیەك لە مێژووی عوسمانی، کورتەیەك لە مێژووی ئیسلام.

[٤٣] ناوی ڕاستەقنەی "محەمەد موختاری کۆجاتاش"ـەو، سالی ١٨٧٥ تا ١٩٤٩ ژیاوە. یەکێك بووە لە بەڕێوەبەرە ناودارەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. کوڕی (شێخول ئیسلام) ئەحمەد موختاری تەرشیحی زادە بووە. مەلا نەجمەدین، خوێندنی خۆی لە مەکتەبی یاسا تەواو کردووەو، کاری پارێزەری و دادوەریی کردووە. دوای مەشرووتییەتی دووهەم، بوو بە پارێزگاری بەغداو، دواتر بە وەزیری داد (١٩٠٩). ماوەیەك بوو بە سەرۆکی شوورای دەوڵەت و، وەك نوێنەری (قەستەمونۆ) بوو بە ئەندامی مەجلیسی مەبعووسان و پارلەمانی گەورەی تورکیا (TBMM).

پاشا[٤٤]ی لەخۆیدا جێکردوەتەوە کە لەڕاستیدا لەکەی ڕەشی سەر هەر ئیدارەیەکی ئازادیخوازن و هەمیشەش دەبن بە مایەی شکستهێنان، چۆن دەتوانێ تۆمەتی سیخوڕی بخاتە پاڵ ئەم و ئەو ؟ ئایا ئەمانە پێیان وایە مێشکی خەڵك تا ئەو ڕادەیە کار ناکات کە ڕاستیەکان لێك بداتەوە ؟!

ئەفەندیەکان ! بۆ ئەوەی لەمە زیاتر نەبنە گاڵتەجاڕی ئەم و ئەو، کۆتایی بەم کۆمیدیا کۆن و دووبارەیە بهێنن.

---

[٤٤] ساڵی ١٨٥٦ لە بەغدا لەدایك بووە. ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەنبووڵ مردووە. کەسێکی عەرەب و بەرپرسێکی دەوڵەتی عوسمانی بووە و ئەرکی فەرماندەیی سوپا، وەزیری، سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی پێ سپێردراوە. دوای ئەوەی خوێندنی خۆی لە ئاکادیمیای عەسکەری تەواو کردووە، لە دائیرەی ئەرکانی جەنگ دەست بەکار بوو. لە (کریت) ماوەتەوەو، ماوەی ساڵێکیش لە (گۆلزو کامپۆفنەر) لەبەر دەستی پاشاکاندا کاری کردووە. دواتر بە پلەی ژەنەراڵ وەرگیرا بە یاریدەدەری فەرماندەی دائیرەی پشکینن و ئەزموونی تۆپخانە. ساڵی ١٩٠١ بوو بە فەریق و، ساڵی ١٩٠٥ یش بوو بە فەریقی یەکەم و بە پارێزگاری کۆسوۆ. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم، ئەرکی سێهەمین فەرماندەی گشتیی سوپای پێ سپێردرا. کاتی ڕووداوەکانی ٣١ی مارت، بوو بە فەرماندەی سوپای پاکسازی و، دەورێکی کاریگەری لە لەسەرکارلابردنی سوڵتان عەبدولحەمیددا هەبوو. لە کابینەکەی حەقی پاشادا، بوو بە وەزیری جەنگ و، کاتی داگیرکرانی بابی عالی لەلایەن ئیتیحادچییەکانەوە و، دوای لەسەرکارلابرانی حکوومەتەکەی کامیل پاشا، کرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران (١٩١٢). دوای ساڵێك لە مەیدانی بایەزیددا بەدەستی کەسێك تیرۆر کرا. چەندین بەرهەمی هەمەجۆری لەبارەی بابەتی عەسکەرییەوە هەیە، کە گرنگترین ئەمانەن: (ڕێکخستن و شێوەی عەسکەریی عوسمانی).

وەڵامی پرسیارو ڕەخنەکان، بەشێوەیەکی یاسایی و بەپێی مافەکان، بدەنەوە، چونکە وەك ئەوەی کە پێشتر نموونەی بینراوە، ئەوی هەوڵی هەڵخەتاندن و پاراکردنی ڕای گشتی و خەڵك بدات، دواجار تووشی شەرمەزاری دەبێ.

من لەکاتێکدا دوژمنانی خۆم بە تاوانبارو خیانەتکار ناوبرد کە تەرمی ڕۆڵە ڕەوشتبەرزەکانی نیشتمان و نووسەرەکان وەك بێژنگ بە کونکراوی لە کوڵانەکاندا داکەوتبوون و، بەشێکی وڵاتەکەمان لە جێگەی ئەلبانیەکان و کراوتیەکانەوە بگرە تا ئەدەنە وێران کرابوو. ئایا ئێستا بەڕاستی دەستی سەبەبکاری ئەو هەموو کردارە بێخێرو خراپانە نەکەوتوەتە ڕوو ؟ مادام باس و قسە لەسەر خیانەتەکانی دوژمنانی منە بەرامبەر بە وڵات و نیشتمان، ئەم پرسیارەش دێتە پێشەوە کە ئایا هەر ئەم کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی"یە نەبوو کە تەرابلوسی ڕۆژئاوای کرد بە قوربانی سیاسەتەکانی خۆی و بوو هۆی ئەوەی کە ئەم بەشە دڵگیرەی خاکی عوسمانی بکەوێتە ژێر پێی دوژمنان ؟! ئێستا هاووڵاتیە ئازاو بەجەرگەکانمان، لەڕێگەی قارەمانیی خۆیانەوە، ئەو نەهامەتیە سیاسیەمان پێ فەرامۆش دەکەن و سووکایەتی و بێخێریەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بە خوێنی خۆیان کەم ڕەنگ دەکەنەوە.

با ئیتر دوژمنانی ئێمە واز لە دژایەتیکردنی ئێمە بهێنن. خۆ ئەگەر بتوانن پاساوێکی گونجاو بۆ ئەم هەموو نەهامەتیە سیاسیانە بهێننەوە، ئەوە دەبێ بە مایەی خۆشحاڵیی ئێمە !

## کێشەی ڕێکخراو (کۆمەڵە)ی نهێنی

کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی،دوای ڕووداوە تاڵەکەی ٣١ی مارتو لەناوبردنی "فیرقەی ئەحرار"و، دوای لەسێدارەدانی هەندێك بێچارەو بێتاوانو بەردەوامبوونی ئەو هەموو زوڵمو زۆرداربیە، لەڕێی ڕاگەیاندنی ئیدارەی باری نائاسایییەوە، مەیدانێکی سیاسیی گونجاوی بۆ پێکهاتنی ئارەزوو و تەماعەکانی ڕەخساندبوو.

لەگەڵ ئەمەشدا، دوای کوژرانی "سەمیم"[٤٥] بە شێوەیەکی خوێنمژانە، نیشانەکانی گەڕان بە دوای دادو مافدا لەنێو خەڵکی پارێزگاکانو ئەستەنبوڵیشدا پەیدا بوونو، دەنگی ناڕەزایی بەرامبەر بە هەندێك ئەفسەرو کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەرزتر بووەوە.

هەر لەم کاتانەشدا بوو کە هەندێك ولاتپارێز کەوتنە هاوکاریمانو، بەشینەوەی بلاوکراوەکانی ئێمەیان بە ئەرکی نیشتمانی خۆیان دانا.

ئەم خزمەتە نیشتمانییە جێی ڕێزەی هاوولاتیانمان، بووبوو بەهۆی ترس لێ نیشتنی بەرپرسانو لایەنگرانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە هەبوونی کۆمەڵەی ئیتیحادی نهێنی.

---

[٤٥] ئەحمەد سەمیم، سالی ١٨٨٤ لە پیرزەرین لەدایك بووەو، سالی ١٩١٠ لە ئەستەنبوڵ کۆچی دوایی کردووە. یەکێك بووە لە ڕۆژنامەنووسانی قۆناغی مەشرووتییەتو، کوڕی سەرهەنگی خانەنیشن تەوفیق بەگ بووە. لە خقوتابخانەی غەڵەگەسەرایو کولێژی ڕۆبەرتی ئەستەنبوڵ خوێندنی خۆی تەواو کردووە. لەبەر نووسراوەکانی لە ڕۆژنامەی "سەدای میللەت"دا، کە زۆرتر لەدژی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بوون، لەلایەن هەمان ڕێکخستنەوە کوژراوە.

لـه ئـەنجامی کـاری سـیخوڕی‌ی هەنـدێك سـیخوڕی بێڕەوشـتەوە، کۆمـەڵێك هاولاتیمـان ڕووبـەڕووی ئـەو تۆمەتانـە بوونـەوە کـە کۆمەڵـەی ئیتیحادو تەرەقی بۆ هـەر نـەیارێك بـەکاریان دەهـێنیٚ. ژمارەیـەکی زۆری هاووڵاتیـان بـە ژن‌و پیـاوەوە بـەو جـۆرە ئەشـکەنجانە سـزادەدران کـە نموونـەیان لـە هیچ جێگەیـەکی دنیـادا بەرچاو ناکـەون. بـۆ نموونـە، بـە شفرەی بەراز هەڵیان دەواسین، یـا نینۆکیـان دەردەهێنـان. هـەروەها لـەم کاتانەدا باسی گـرفتی ڕەزا نوور بـەگی ئەنـدامی ئەنجومـەنی نوێنـەرانی خـەڵك کـە مرۆڤێکـی نیـشتمانپەروەر بـوو، بـە خوت‌وخـوڕایی قـوت کرایـەوە. شـایانی باسـە، ئـەم درۆو دەلەسـەیە هـەمووکاتێك، وەك پەڵەیـەکی ڕەشـی ملهوڕییـەکی مەترسـیدار، بـە نێوچـاوانی کۆمەڵـەی ئیتیحادو تەرەقی‌ی دڕندەوە دەمێنێتەوە.

دوژمنـانی ئێمـە کـە بـە ڕووکـەش هـیچ کـەس‌و لایـەنێکی دەرەوەی خـۆی بـە مەشـرووتییەتپەروەر نـەدەزانی، لەڕاسـتیدا هـەموو جـۆرە خراپی‌و زۆرداریی‌یەکیان دەنواند. بـەبیٚ ئـەوەی هیچ هۆیـەکی یاسایی‌و هیچ چاوەڕوانییەك لەئارادابێ، مرۆڤەکانیان دەستگیر دەکرد. تەنانـەت بە پێشیلکردنی یاسای بنەڕەتی‌و گوێنەدانـە مەشرووتییەت، ئەنـدامی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکیان دەگرت‌و ئەکەنجەشیان دەدا.

هەڵبەت ڕۆژێك دادیٚ ئەو بێچارانەی وا بە بۆنەی کێشەی (کۆمەڵـەو ڕێکخـراوی نهێنـی[٤٦])وە ئەشـکەنجەیان لـە دەسـتی ئـەم کۆمەڵـە مرۆڤـە

---

[٤٦] کۆمەڵە (ڕێکخراو)ی نهێنی، ئەمە ناوێك بوو ئیتیحادچییەکان بۆ تاوانبارکردن‌و لـەناوبردنی نـەیارانیان بـەکاریان دەهێنـا. نـاوی دامەزرێنـەکانی کۆمەڵـەش بـەکار دەهـات. بـەگوێرەی بۆچـوونی ئیتیحادچییەکان، ئـەم ڕێکخـراوە لەلایـەن شـەریف

تەماعکارو دڵڕەق و بێڕەوشتە کێشاوەو وەجاخیان کوێر بوەتەوەو سزای دوورخستنەوەیان بۆ دەرکراوە، چاویان بە پەیدابوون و سەقامگیربوونی دادو هەقخوازی دەکەوێ. ئایا لەڕاستیدا ئەو کینەو تووڕەیی و نەهامەتی و بێبەشیەی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ی شاراوە دەبووەوە، ئەنجامی بێعەدالەتی نەبوو ؟

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك داوای لێکۆڵینەوەی تایبەت بە کێشەی (کۆمەڵەی نهێنی)ی کردبوو، بەڵام شەوکەت مەحموود پاشاو دارودەستەکەی، لەڕێی فێڵ و تەڵەکەبازی و هەڕەشەکردنەوە، دواین زەبری خۆیان بە دادو هەقخوازی گەیاندو، کۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەم بەڕێوەچوونی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا دروست کرد. لە ئەنجامدا ئەوانەی وا لێپرسینەوەو کاری لێکۆڵینەوەی ئەنجومەنیان پێ سپێردرابوو، تەنانەت لەوەش ترسان کە -بە ڕواڵەتیش بێ- خۆیان بە لایەنگری ماف و یاسا

---

پاشاوە بۆ مەبەستی تایبەتی لە ئەستەنبوول دامەزراوە. بەقسەی ئەوان، ئەم ڕێکخراوە کە دکتۆر ڕەزا نوورو مستەفا ناتیق بەڕێویان دەبرد، بەرنامەی کوشتنی مەحموود شەوکەت پاشا و تەڵعەت بەگ و مەلا نەجمەدین و ورووژاندنی خەڵکیان لەڕێگەی قەحپە جگەرەکێشەکانی (مەیدانی فاتیح)ەوە داڕشتووە.

ساڵی ١٩١٠ دکتۆر ڕەزا نوورو نەوەد کەسی تری بەم تاوانانەوە لە دادگای جەنگی یوسف کەنعان پاشا کە هەموو دادوەرەکانی ئیتیحادچی بوون، موحاکەمە کران. دادگا ٤٥ کەسی بە سزای جۆراوجۆری زیندانیکردن و دوورخستنەوە گەیاندو، پێنج کەسی تریش کە دکتۆر ڕەزا نووریشی تێدا بوو، بە بێتاوان دانا. بەڵام ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو دکتۆر ڕەزا نووریان دەستگیر کردەوەو، ماوەیەکی تر خستیانە ژێر چاودێری و ئەشکەنجەوە. ئەو کاتانە دکتۆر ڕەزا نوور نوێنەری پارلەمان بوو، بەڵام تەنانەت مافی ئەوەشی پێنەدرا پارێزەرێك بۆ خۆی بگرێ.

بناسێنن. بێگومان کاتی هێنانەوە یادی ئەو ڕووداوە تاڵو دڵتەزێنانەی مێژووی مەشرووتییەتی عوسمانی، نەفرەتو لەعنەت لە سەبەبکارەکانی ئەو کارەساتانە دەکرێ.

لە لایەکی ترەوە، با ئەم پرسیارە بکەین کە کۆمەڵەی نهێنی چ واتایەکی هەیە ؟ ئایا شتێکی لەوە زیاتر مایەی پێکەنین لە دنیادا هەیە کە نەیارە کەللەپووتەکانمان تۆمەتی بنیاتنانی کۆمەڵەو ڕێکخراوێکی نهێنی بخەنەپاڵ کەسێك کەوا هەر لەسەرەتاوە بەتوندی دژی کارە شاراوەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ڕاوەستاوەو، لەو ڕێگەیەشدا هەمووجۆرە لەخۆبوردنێکی نیشان داوە.

بەر لە هەمووشێك کۆمەڵە (ڕێکخراو)ی نهێنی، بە کۆمەڵەیەکی وەك ئیتیحادو تەرەقی دەگوترێ کە ژێربەژێر ڕێکخراوی نهێنی پێك دەهێنێو ئاسایشی وڵات تێك دەداتو، لە ڕێگەی چەتەکانی خۆیەوە، مرۆڤ بە شێوەیەکی دڕندانە لە ناوەڕاستی کۆڵانو شەقامەکاندا دەکوژێو دەستەپیسەکانی خۆی تەنیا بۆ جەردەییو دزی وەردەداتە ناو کاروباری حکوومەت. بە کورتی، ڕێکخراوێکی یاخییە کە کرداری ناشایستەی لە سەدەی بیستەمدا لێ دەوەشێتەوەو، وەك لەکەیەك بە نێوچاوانیەوە دەمێنێتەوە.

زۆر شوکرو سوپاس بێ کە ئێمە لەم پێناوەدا هیچ تاوانێکمان نەکردووەو، کەسیش نەیتوانیوە مەسەلەی داواو ئارەزوویەکی تایبەتی ئێمە بخاتە ڕوو. بەپێچەوانەوە، ئەمڕۆ بەرنامەیەکمان هەیە، هەموو دنیای شارستانی دەیزانێو پەسندی دەکات. هەروەها بەو ئەندازەیەش دۆستو لایەنگری یاساییمان هەیە.

به واتایەکی تر، لەبەر ئەوەی دادو هەقخوازی هەمیشە جێی خۆیان دەکەنەوە، ئێستا لایەنگرانی ئێمە لەوە زیاترن کە چاوەڕوانمان دەکرد. جا ئەگەر ئەم دەرکەوتن و خۆنواندنەی مێژوو بە دڵی دوژمنانمان نییە، ئێمە چی بکەین ؟ خۆی لەڕاستیدا هەوڵ و کۆششی کۆمەڵەی نەفرەتلێکراوی ئیتیحادو تەرەقی کە خۆی بە چارەنووسسازێک دادەنێ بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەوەی (پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی عوسمانی)[٤٧] بە ڕێکخراوێکی کۆنەپەرست لەقەڵەم بدات، بەڵگەیەکی ئاشکراو زیندووی زۆرداری و پاوانخوازییە.

دیوانی عورفیی جەنگ لەبارەی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەوە کە بەناوی (کۆمەڵەی نهێنی)وە تاوانبار دەکران، چ جۆرە بەڵگەیەکی کۆکردەوە ؟ هیچ شتێك !

ئەوی ڕاستی بێ، پێویستە مرۆڤ شێت بێ بۆ ئەوەی بتوانێ بەرنامەی "دەستەی ڕیفۆرمی بنچینەیی" بە بەرنامەی "کۆمەڵە یان ڕێکخراوێکی

---

[٤٧] گرووپی ڕیفۆرمی بنچینەیی، ناوی تەواوی پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی عوسمانییە، ساڵی ١٩٠٩ شەریف پاشا لە پاریس دایمەزراند. ناوی فەرەنسیی ئەم پارتە (Le parti Raditolottompn) بوو. کەسانی وەك عەلی کەمال، مەولان زادە ڕفعەت، پەرتەو تەوفیق، دکتۆر ڕەفیق نەوزاد. ئالبەرت فوا، کەمال عەونی ئەندامانی دەستەی دامەزرێن و بەڕێوەبەری ئەم پارتە بوون.

لەڕێگەی "مەشرووتییەت"ـەوە کە ئۆرگانی ڕاگەیاندنی ئەم پارتە بوو، دژایەتییەکی ئاشکرای دژ بە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەکرد. لایەنگرانی ڕێکخستن لە ناوەوەی وڵاتدا بە تاوانی ئەندامێتیی ڕێکخراوێکی نهێنی درانە دادگاو سزای قورسیان بۆ بڕایەوە. ئەم پارتە ساڵی ١٩١٢ لەگەڵ پارتی "حوڕڕییەت و ئیئتیلاف" دا بوو بەیەك و شەریف پاشا بوو بە سەرۆکی پارتە تازەکە.

شاراوه" دابنێ. بێگومان قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەیەك لەنێو وڵاتدا لەلایەن کۆمەڵێك نوێنەری پاوانخوازەوەو، هەڵکێشانی نینۆکی مرۆڤەکان، کوشتن و بڕین و ئەشکەنجەو دوورخستنەوەو، کاتێك ڕێکخراوێکی بێخێرو شاراوەی وەك "ئیتیحادو تەرەقی" لەئارادابێ کە ملهوڕی و گەندەڵییەکی لەبیرنەکراوی لێدەوەشێتەوە، تاوانبارکردنی لایەنی تر بە کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی، نموونە هەمەجۆرە نەبینراوەکانی جەردەیی و خراپەکاریی ئەون.

هەروەها هەوڵی لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانەیان دا کە کەم تا زۆر لە هەرچوار لای وڵاتی عوسمانییەوە، لەسەر ئەم کێشەیە، دژایەتیی ئەوانیان دەکرد. لەم بارەیشەوە، تا ئەندازەیەك کارەکانیان بە سەرکەوتوویی هەڵسووڕاند. بەڵام پێویستە بیر لەوە بکرێتەوە کە کاتی خۆی پادشای لەسەردەسەڵاتلابراویش "سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم" سەرکەوتوو دەبوو. بەڵام لەکۆتاییدا چیی لێ هات ؟ هیچ نەبوایە پیویست بوو چارەنووسی ئەو کابرایە هەستێکی لەواندا دروست بکردایە. بەڵام مخابن ! کەسە سەرکەوتوەکانی ئێمە دەرك پێکردنێکی لەم شێوەیە لە وزەیاندا نەبوو. دوای ئەوەی هەموو خوێندنەوەکانی خۆمان لەسەر ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە خستە بەرچاو، ڕوونکردنەوەی خاڵێکی تاریکیش بە ئەرکی خۆمان دەزانین. هیچ کاتێك و بە هیچ شێوەیەك، پەیوەندیمان بە (کۆمەڵەی دامەزرێنەکان)ـەوە نەبوە کە مەولان زادە ڕفعەتی خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی "سەربەستی"ی ویژدانفرۆش بە برە پارەیەك دایمەزراندووە.

# تاوانبارکرانەکەی ئێمە

کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، هەمووکاتێك بە هەموو فرتوفێڵێکی خۆیەوە، ئێمەی بە کۆنەپەرستو (سیخوڕ)و ملهوڕ تاوانبار دەکردو، دەیویست لەکەدارمان بکات. لەئەنجامیشدا بۆ تۆڵەسەندنەوە، لەڕێی کێشەو مەسەلەی کۆمەڵە (ڕێکخراو)ی نهێنییەوە، ئێمەیان تاونبار کرد. جێی باسە، ئەو حکوومەتو بڕیارانەش لای ئێمە هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان نییە.

بڕیارە بەجێو دوور لە دادەکانی ئەو ساختەچیانە دژ بە ئێمە، کە بەناوی ئازادیو ساتوسەوداوە دەیکەن، لای ئێمە بە نیشانەیەکی وڵاتپارێزیو شەرەفمەندیمان وەردەگیرێن. لەبەر ئەوەی ئێمە لە ئاستی بێڕەوشتیو ستەمکاریی ئەواندا ناڕازی بووین کە مرۆڤە بەناموسەکانیان دەکوشتو ڕۆڵە نیشتمانپەروەرەکانی ئەم وڵاتەیان لە ناوەڕاستی شەقامدا وەك بێژنگ کون کون دەکردو لاوەکانیان ئەشکەنجە دەدا" مافە مەدەنیەکانیان لە خوتوخۆڕاییو بەبێ هیچ شتێك لە ئێمە وەرگرتەوەو بڕیاری زیندانیکردنی هەتاهەتاییان(٤٨)

---

(٤٨) زیندانیکردنی هەتاهەتایی، ئەمە سزایەك بوو لەکاتێکدا فەرمانبەرانی دەوڵەتی عوسمانی تاوانێکیان بکردایە، بەسەریاندا دەسەپێنرا. بەپێی یاسای سزای عوسمانی، ئەوانەی وا بەم جۆرە سزا دەدران، دەبوو ماوەی سزاکەیان لەناو قەڵایەکی سەرداپۆشراودا بەسەر ببردایە. ساڵی ١٨٥٨، گۆڕانکاری لە یاسانامەی

بەسەردا سەپاندین. لەوەش زیاتر، وەك بلێی هەموو ئەمانە کەم بێ، ئەو هەموو دوژمنایەتیو خیانەتانەیان دەرهەق بە هاوسەرەکەشم کردو، بەناوی دادو هەقخوازییەوە دەستدرێژیو سووکایەتییان پێکردین. لەبەر ئەوەی ئاگامان لە باری دەروونیی دوژمنانی ئازادی هەبوو و، دەمانزانی تا چ ئاستێك لە تایبەتمەندیو شتی باش دوورن، ئەم پەلامارە دڕندانەمان بە شتێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدا.

بێگومان ئەوانەی وا لە مەشرووتییەت هەڵدەگەڕێنەوە، دەبن بە دوژمنی مرۆڤە ئازادەکان. ئایا باپیرە بەناوبانگەکەیان، یانی سوڵتانی لەسەر کارلابراو "عەبدولحەمیدی دووهەم"، هەمان مامەڵەیان بە هەمان مەبەستەوە لەگەڵ ئێمەدا نەکرد ؟

نەمتوانی بەبێ هێنانەوەی کورتەیەکی بڕیاری دادگاو چەند قسەیەك لەسەر ئەوانە، درێژە بە باسەکەم بدەم. دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر کارەساتی (کۆمەڵەی نهێنی)داو، ماوەیەك بەر لە ئێستا، بڕیاری دادگاکەیان بە من ڕاگەیاند کە پڕ لە درۆو دەلەسەو بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

بەگوێرەی ئەو بڕیارنامەیەی کە ((یەکسەر پشت بەستوو بە ڕاستیی ڕووداوەکە نووسراوە))، باسی ئەوە دەکرێ کە لەبەر ئەوەی،

---

شاهانەدا (ئەوی ساڵی ١٨٤٠) کرا. بەڵام دیسان هەر ئەو سزایەی تێدا مایەوەو، سزای کارکردن (لەگەڵ زیندانیکردندا) بۆ کەسانی ئاسایی (سڤیل) زیادکرا. ئەم سزایە بۆ ئەو کەسانەش دەبڕایەوە کە ئەرکی سیاسیی خۆیان بۆ خراپەکاری بەکار دەهێنا.

ئەم تاوانبارانە مافی ئەوەیان نەبوو چاویان بە هیچ کەسێك بکەوێ و، هەمیشە چاودێری دەکران. ئەم سزایە دوو جۆری هەبوو: یەکێکی هەتاهەتایی، ئەوی تریش بۆ ماوەی (٣-١٥) ساڵ بوو.

بەپێی یاسای وەرگرتنەوەی پلە (دەرەجە)، پلەکەمانیان تا ئاستی فەرماندەیی خوارووتر لە فەریقی یەکەم دابەزاندووە، ئێمە دڵ نیگەران و تووڕە بووین و، لە ئەنجامی ئەوەشدا، بۆ (ویست و داخوازیەکانی خۆمان) بەرامبەر بە دەوڵەتی پیرۆز، ڕێکخراوێکی شاراوەمان بەناوی ڕیفۆرمی بنچینەیی یەوە دامەزراندووەو، لەبەر ئەوەش، بەپێی نازانم چەندەمین برگەی یاسای سزای مەدەنی !!! (ئەوانەی وا بە سەرباز لەقەڵەم نادرێن)، هەموو مافە مەدەنیەکانیان لێ وەرگیراوەتەوەو، بڕیاری سزای زیندانی هەمیشەیی یان بەسەردا سەپاندووین.

بەر لە هەمووشتێك، پێویستە باسی ئەوە بکرێ کە چوارپێنج مانگ پێش ئەوەی یاسای وەرگرتنەوەی پلە لە ١٢مارتدا بکەوێتە مەیدانی جێبەجێکردنەوە، من داوانامەی دەست لەکارکێشانەوەی خۆمم پێشکەش کردووەو، ئەمەش بە شێوەیەکی یاسایی تۆمارو پەسند کراوە. بۆیە ئەم جۆرە بەڵگەو پاساوهێنانەوەیەی دادوەرە قارەمانەکانمان، بەتەواوەتی درۆو دەلەسەیە.

لەلایەکی ترەوە، باسی ئەوە دەکرێ کە ئێمە لەبەر ویست و داواکاریەکانی خۆمان دژ بە حکوومەتی پیرۆز ڕاوەستاوین" لەمەشدا هەڵەیەکی ئاشکرا لەئارادایە، چونکە من ئەم خەباتە پیرۆزو پڕ لە خۆشییە بەرامبەر بە حکوومەتی پیرۆز ناکەم، بەڵکوو ئەم کارە لەدژی سووکترین جۆری بوونەوەرەکان دەکەم، کە لەناوەوە وەك کرم خەریکی خواردنی جەستەی ئەم وڵاتەن.

ئەو بوودەڵانەی کە حکوومەتی پیرۆزو بوونی دەوڵەتی عوسمانییان خستوەتە بەر مەترسی و بە ئاشکرا لەبەر چاون، زۆر شوکر کە ئێستا

زۆرینـەی خـەڵك بـە گـەورەو بـچووكەوە نەزانـێ چ كەسـانێك دەیانـەوێ ڕۆژبـەڕۆژ خـەڵك كوێلـەتر بنو هەزارویـەك چەشـنی زوڵـمو سـتەمیان لێبكەنو بیانكەنە دیلی دەستی خۆیان. پێشتر باسی كێشەی كۆمەڵەی شـاراوەم بـە ڕاشـكاوی ڕوون كـردەوە. دوای خوێندنـەوەی بەرنامــەو پرۆگرامی پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی، ئەگەر كەسانێك پەیدابنو وەك چۆن لـە دەقـی بڕیارنامەكـەدا بـاس كـراوە، تۆمـەتی وەك "خراپـەكاریو ئـاژاوەگێڕی" و هەوڵـدان بـۆ لەسـەركارلابردنی كابینـەی حكوومـەتو وەزیـرانو بڵاوكردنـەوەی ئەنجومـەنی نوێنـەرانی خـەڵكو تێكۆشـان بـۆ ئاژاوەنانەوەو بەرپاكردنی ڕاپـەڕینو سەرهەڵدان لـە وڵاتـدا، بخەنـە پاڵ ئـەم ڕێكخستنە، ئەوا پێویستە دوعای ئەوەیان بۆ بكرێ كە خوای بەخشندەی عـەقڵو تێگەیـشتن كـەمێك ئاسـتی فامكردنیـان بـەرزتر بكاتـەوە. پـێش هەمووشـتێك، لەبـەر ئـەوەی لەسـەركارلابردنی كابینـەی حكوومـەتو وەزیران، ئامانجی سەرەكیی هەر پارتێكی سیاسییە، دانانی ئەم خاڵە بە تاوانێك، شتێكە بە بیركردنەوەیەكی ئاسایی و خۆڕسك پەیدا نەبوە. خاڵی دووهەمیش ئەوەیە، ئایا ئەمە یاسازانییەكی پێكەنیناوی نییە ؟ كوشتنی هەندێك مـرۆڤو تێكـدانی ئاسـایشو ئاسـوودەیـیی ویژدانـەكان، كـارێكی شێتانەیە. پێمان وایە كۆمەڵەی ئیتیحادو تـەرەقی، بۆ ئەو ستەمو ئازارەی كە بە ویژدانە پاكەكانی چێشتووەو، بۆ ئەو خوێنە پاكو بێتاوانانـەی كـە وەك لەكەیـەكی شـەڕەنگێزیو خراپـەكاری ناوچـاوانی خـۆی پـێ سـوور كـردوون، هـۆی جیاجیـا دەهێنێتـەوە. هـەر كەسـێكی نـاڕازی بەرامبـەری ڕابوەسـتێ، بـە تاوانبـاری دادەنـێ. بـەكورتی، دەتـوانین بڵـێین: ئەمانـە هەمووی ترسێكی سەیری تۆڵەسەندنەوەیە.

لەئەنجامـدا دەردەکـەوێ، تاوانبـارکرانی ئێمـە تـەنیا بەرهـەمی خیانـەتکاری و بەربـەرەکانـیی دوژمنـانی منـە. ملـی ئێمـە، لـە ئاسـتی بڕیـاری دادگـای گـەورەی نەتـەوەیی و ویـژدانی خەڵکـدا، لـە مـوو باریکیترەو سەری ڕێزی بۆ دادەنێین.

که چاومان پێ دەکەوێ وا هاوولاتیانمان دەستە دەستە بەشداری خەبات و کاروبارەکانمان دەبن، هەست بە شادی و بەختیاری دەکەین.

ئـەم تـام و چێژە کـە شتێکی تایبـەتی مرۆڤـە ئازادەکانـە، لای ئێمـە سـەدقاتی ئـەو تاوانبارکردنـە سـەیرو سـەمەرانە گـرنگترە. بڕیارەکـانی دوژمنـانی ئـازادی، کـە پـڕن لـە ملـهوڕی و سـتەمکاری، سـتەملێکـراوە ئازادیخوازەکان بە نیشانەی شەرەفمەندی و نیشتمانپەروەریی لەقەڵـەم دەدەن. هـەر لەبـەر ئەمـەش، بەخۆشـییەوە پێـشوازیمان لـە بڕیـاری ملهوڕانەی ئەو دادگا نیازخراپە کرد. هەر بژی ماف و داد.

## ڕاستی

ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچێ چەرخی ڕۆژگار وڵاتەکەمانی خستوەتە ناو قۆناغێکی بێسەروبەرەوە. بۆیە لەوکاتەوەی کە وڵاتەکەمان لەناو ئـەم ئـاڵۆزی و قەیرانەدایـەو، ناچـاری ئـەوە کـراوین لـەژێر دەسـەڵاتی مشتێ ناکەسی هیچ وپووچدا بین و، نـەزانی و سووکایەتی و داواکانیـان دەربـبـەین، ئێمـەش بڕیـاری دەسـتپێکردنـی ئـەم خەباتـە پێـرۆزو خۆڕاگرانـەمان داوە. لـەم پێناوەشـدا، هـیچ جـۆرە کۆسپێك نـەیتوانی و ناتوانێ کەلەبەرو ناتەواوی بخاتە ناو کارو چالاکیەکانمان.

دوژمنـەکانم، هەمیشە باسـی پاشـکەوتوویی و پـاوانخوازی منیـان دەکردو، تەنانەت ئەم ماوەیەی دواییش باسی هەڵگەڕانەوەی منیان لە دیـن هێناوەتـە ئاراوە. هـەروەها بـەردەوام هـەوڵی ئـەوەیان داوە کـارو چالاکیەکانم لـەپێناوی مـافو ئازادی‌ی نیـشتماندا، بـە خیانـەتکاری نیشان بدەن‌و خەڵکی وەها تێ‌بگەیەنن. وەك ئەوەی ئەم هـەموو کردەوە نابەجی‌ و ناشایستەیە کە بەناوی ماف و دادو ڕەوشت‌و مرۆڤایەتییەوە دەیانکرد، بـەس نـەبێ‌و کـەم بـێ، بـەبێ شـەرمییەوە باسـی ئەوەشیان دەکـرد کـە گوایـە ئـەم خەباتـە نیـشتمانییەی ئێمـە تـەنیا گەمـەو ڕابـواردنێکی دەوڵەمەندانەیـەو، ئێمـە لەبـەر ئـەوەی پارەیـەکی زۆرمـان هەیە، ئەم کارانە بۆ خۆسەرقاڵکردن دەکەین ! باشە، خۆی‌لەخۆیدا لـەوە زیاتر چاوەڕوانی هیچ شتێکی ترم لەوان نەدەکرد.

بـەڵام ئایـا ئەگـەر مـرۆڤ زۆر بێ‌عـەقڵ‌و کەللـەپووت نـەبێ، تەرکـەوتن‌و دژایـەتیکردنی ئـەم دەسـتە فێڵبـازو ساختەچیە بـە مەبەسـتی ڕابـواردن‌و خۆشی، کارێکی منداڵانە نییە ؟ ئامانجی دوژمنـە نەفرەتیـەکانمان لـەم شتەدا ئەوەیە کە لەڕێگەی نیشاندانی ئەرکی نیشتمانـی‌ی ئێمـەوە بە سـەرگەرمی‌و ڕابوردان، ڕای گشتی‌ی خـەڵك بخەنـە گومـان‌و دوودڵییـەوەو، وای دەربخـەن کـە کەسـی تـر لـە خۆیان بەدەر بایـەخ بەم نیشتمان‌و نەتەوەیە نادات‌و، بەو جـۆرەش ڕێگـر بـن لەبـەردەم کەسـێکدا کـە پارێزگـاری لـە ئـازادی‌و خاوەنایەتی‌ی مەشرووتییەت بکات‌و، بە هـەمان شێوەش، وڵاتـی بێ‌چارەی عوسمـانـی‌ی ڕوو لـە نـابووتی‌و لەناوچـوون ، بخەنـە خزمـەتی ویـست‌و داواکاریـەکانی خۆیـان. مەگـەر بـە شـێوەیەکی ئاشـکرا باسـی ئەمـە ناکـەن ؟ ((ئەگەر لەناو دەچێ، با بە دەستی ئێمە لەناو بچێ)) !

ئێستا منیش بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنم کە ئەو ڕێگەیەی وا گرتوومانەتە بەرو ئەو هەموو کارەی کە بە ئەنجامی دەگەیەنین، هیچیان لەبەر دەوڵەمەندی نییە، بەپێچەوانەوە، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە هەستمان بە ئەرکی پیرۆزی نیشتمانیی خۆمان کردووەو، ویژدانمان وەهای دەوێ. ئەو خەرجیانەی کە لەپێناوی وڵاتو مەشرووتییەتدا کردوومە، هەمووی هی داهاتی خۆمە کە بەزۆر و ناڕەحەتی بەدەستی دەهێنم.

زۆر شوکر کە ئێمە وەك ئەوان سەروەتو سامانێکمان نییە، بەزۆر لە خەڵك وەگیرابێ و لە سامانی نەتەوەیی دزرابێ. تائێستا هێندەی پێم کرابێ خەرجی زۆرم لەپێناوی نیشتماندا کردووەو دەیکەم. لەڕاستیدا، لەبەر ئەوەی ئەرکی سەرشانی خۆم لەم ڕێگەیەدا بەجێهێناوە، زۆر خۆشنوودو خۆشحاڵم. بە دڵێکی سووتاو بە ئاهی نیشتمانەوە کە بۆ ئازادی لێدەدات، گەیشتومەتە ئەم ئاسوودەییە گیانیی و خۆشنوودییە ویژدانییە. ڕاستیەکەی، خەزێنەکەی ئێمە لەنێو ئەم شتە پیرۆزو خۆشەویستانەدا شاردراوەتەوە.

## ئەندێشەی ئاینده

ئێستا کۆمەڵەیەکی نەزانکردو خراپەکار لە وڵاتدا باڵادەستەو، ڕۆڵەکانی وڵاتی عوسمانی دەکوژێ‌و، بە کردەوەکانی خۆی هێزمان لێ دەبڕێ. لەلایەکی ترەوە دوژمنەکانمان لە دەرەوە بەرنامەی پارچەپارچەیی و دابەشکردنی نیشتمانەکەمان دادەڕێژن. پادشای بوڵغارستان، بەم جۆرە بۆچوونانەوە دەستی بە دانوستاندن کردبوو

لەگەڵ دەوڵەتی نەمسادا. حکوومەتی ڤیەنناش، بە کەڵکوەرگرتن لەم بێهێزییەی ئێمە، بە هەموو شێوەیەك هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی و داگیرکردنی وڵاتی ئێمە دەدات. هەرچەندە هەستی نەتەوایەتیمان زامداریش بکات، پێویستە باسی ئەم ئەندیشانە بکرێ و ئەو فێڵ و خراپەکاریانەش کە لەدژی ئێمە دەکرێن، ڕوون بکرێنەوە.

پلانی دابەشکردنی وڵاتی عوسمانی، بەگوێرەی دواین هەواڵەکان، بەم شێوەیەیە: نەمسا لەلایەکەوە دەیەوێ ئەلبانیەکانی باکوور بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و، بەو چەشنە بگاتە سەلانیك" لەلایەکی ترەوە، بیر لەوە دەکاتەوە بەلگراد کۆنترۆڵ بکات، چونکە ئەگەر سربستان بێتە ناو چنگی پاشایەتیی مۆنتینیگرۆ (قەرەداغ)، ئەوا پاشایەتییەکی تازەی سربی دادەمەزرێ. ئەم پاشایەتییە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ قەرەداغدا دەبێ بەیەك، سنوورەکانی خۆی تا کەنارەکانی (ئادریاتیك) فراوانتر دەکاتەوە. شایانی گوتنە، سربەکانیش هەروا نامێننەوەو، دەکەونە هەوڵ و تەقەلای خۆیان. بەشێکی سنووری سربەکانیش دەچێتە ناو قەڵەمڕەوی ڕۆمەکان. ئیتاڵیا دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەلبانیای باشوورو، بوڵغارستان دەکەوێتە هەوای فراوانکردنی سنوورەکانی خۆی تا (دەدە ئاغاجی و کاواڵا). یۆنانیەکان دورگەی کریت و هەندێك دورگەی ترمان لێ دەستێنن. ڕووسیایش، دوای ئەوەی مەسەلەی ملەو یاڵە سروشتیەکان، لەگەڵ جێگەکانی تردا، بە قازانجی خۆی کۆتایی پێدێنێ، هەوڵی کۆنترۆڵکردنی ئەستەنبووڵیش دەدات. ئەڵمانیاو فەڕەنساو ئینگلتەرە، لە سووریاو عەرەبستان و عیراق و، تەنانەت ئەنادۆڵیش، پارێزگا بەکەڵکەکان دەخەنە ژێر دەستی خۆیان و داگیریان دەکەن.

داخۆ ئەم ئیدارەیەی ئێستا کە بووە بەهۆی ئەوەی وا لە کۆڕو کۆبوونەوە سیاسییەکانی ئەوروپا و دان‌وستاندنە نێودەوڵەتیەکاندا بەئاشکرا باسی ئەم شتانە بکرێ، دەتوانێ چ جۆرە پاساوێك بۆ کردارەکانی خۆی بهێنێتەوەو چ بەهانەیەکیان بۆ بدۆزێتەوە ؟!

ئێمە بە ڕەچاوکردنی هەر جۆرە ناڕەحەتی و لەخۆبوردنێك و لەڕێگەی ئاشکراکردنی ئەم ڕاستیانەوە، داوا لە هاووڵاتیانمان دەکەین هۆشیار بن و ئاگایانە ڕەفتار بکەن. ئەگەر کەسانێك هەبن چاوپۆشی لەم شتانە بکەن و گوێ لە قسەکانمان نەگرن، ئەوا بەرامبەر بەوە، دڵنیام لەداهاتوودا کەسانێك پەیدا دەبن بڵێن: (( پێویستە لایەنگری هەق و ڕاستی بین، ئەم پیاوە هەوڵی ئەوەی دابوو ڕێگەمان پێ نیشان بدات))و، بەباشی دەمانهێننەوە یاد.

بەڵام ئایا ئەو ڕەحمەتەی کە بۆمان دەنێرن، بەشی ئەوە دەکات لە ئاستی بەدبەختی و چارەڕەشی ی وڵاتی عوسمانیدا دڵمان بداتەوە ؟

ئایا هەموو تەقەلاو خەباتێکمان بۆ ئەوە نەبوە کە بەهۆی ئەو خەباتەوە ڕێ لەم ئازارە گیانییە ؟ بۆ ئەوەی مرۆڤ قەناعەتی بەمانە نەبێ، پێویستە، وەك دوژمنەکانی ئێمە، لە هەموو جۆرە هەستێکی مرۆڤایەتی دوورکەوتبێتەوە. ئەی بێچارەکان ! بەتایبەت هەندێك وڵاتی گەورەی ئەورووپا، دەیانەوێ ئەم ناوەندە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر بەر لەوەی ئەم جۆرە ئامانجانە بێنەدی، بەئاگا بێینەوەو بەخۆدا بچینەوەو بنەماکانی مەشرووتییەت بنجبەست بکەین و ڕێز لە بچووکترین و گەورەترین بنەماکانی ئازادی بگرین و لە وڵاتی خۆماندا دایبمەزرێنین، ئەوا دەتوانین ئەم

کەش‌وهەوا هەڵاوساوە سیاسییە بگۆڕینەوە بە ئاشتی‌و ئاسایش لە وڵاتەکەماندا.

بۆ ئەوەی گەل‌و حکوومەتی عوسمانی لەم مەترسییە ڕزگار بکەین کە ڕۆژ بە ڕۆژ نزیکتر دەبێتەوە، پێویستیە بەر لە هەر شتێك، لە وڵاتەکەماندا ڕێز لە یاسا بگرین‌و، مافەکان بە شێوەیەکی یەکسان‌و هاوبەش سەقامگیر بکرێن. تەنیا شێوازێکی ئازادیخوازانەی بەم جۆرە دەتوانێ ئەم وڵاتە لێقەوماوە لە مەترسیی نابوودی ڕزگار بکات‌و بپارێزێ. بەڵام، مخابن! وڵاتەکەمان جگە لە دوژمنی دەرەکی کە خەیاڵی جۆراوجۆریان لەسەردایە، هەندێك دوژمنی پاوانخوازی ناوەکی‌و ڕۆڵەی لاسارو نەفرەت لێکراوی هەیە.

## ئاگاداری

دوای ئەوەی ئیتاڵیەکان پێی ناموبارەکیان خستە سەر خاکی عوسمانی‌و، هاتنە ناو گۆشەیەکی خاکی ئەم وڵاتە بێچارەیەو ویستیان تەرابلوسی ڕۆژئاوا داگیربکەن، گەلی عوسمانی ڕاپەڕینێکی شێرانەی شایستەو شیاوی خۆی بەرامبەر بە کەمتەرخەمی‌و خیانەتی حکوومەتی ئێستا بەرپا کرد. بەڵام خۆزگە، هەر دوای ئەوە، پەلامارێکی دوژمنانی ناوخۆیان بدایەو، ئەوانەشیان لەنبردایە.

بێگومان ئێستا تەرابلوس نموونەیەکی جوامێریی ڕۆڵەکانی وڵاتی عوسمانییە، بە شێوەیەکی نموونەیی بەرەو پێشکەوتنی دنیای شارستانی دەچێ‌و، لەلایەکی ترەوە، لەبەر ئەو بانگەوازەی کە لە دنیای عوسمانییەوە بۆ بەرقەرارکردنی دادو ئازادی‌و ڕزگاری دەیکات،

سەرنجی هەموو جیهان بۆ خۆی ڕادەکێشێ. ئەوکاتە دەبوو بگواترایە ((خوێن و ڕۆحێکی تازە کەوتۆتە ناو جەستەی دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی)). لەڕاستیدا ئەمە زۆر پێویست بوو بۆ ئێمە. بەواتایەکی تر، زۆر پێویست بوو بۆ ژیان و مانەوەمان.

دوابەدوای ئەم خیانەتەی کە گەورە لێپرسراوانی حکوومی لەم وڵاتەیان کرد، چەندین ڕووداوی تری تاڵ و خراپ هاتە ئاراوە. بەڵام ئێمە لە یەکەم ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی خۆماندا، چاپۆشیمان لەم خیانەت و بەدکاریانە کرد. یانی نەك هەر هیچ بەرگرییەکمان نەکرد، بەڵکوو جووڵەمان نەکرد لە جێگەی خۆشمان.

ئیتاڵیەکانی ناو خۆمان و کۆمەڵی بەدکرداری ئیتیحادو تەرەقی، بە فریودان و هەڵخەڵەتاندن، بە شێوەیەکی نایاسایی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵکیان بڵاوە پێکرد بۆ درێژەپێدانی خۆشی و ڕابواردنی خۆیان. ئەم شێوازی مامەڵەکردنە، بە ئاشکرا بنەماکانی مەشرووتییەت و ئازادیی پێشێل دەکرد. بەرامبەر بەم هەڵسوکەوتە خراپانە، پێویست بوو وڵاتێکی ئازادیخوازی وەك عوسمانی بە گیان و بە دڵ پارێزگاری لە مافە نەتەوەییەکانی خۆی بکردایە. بەڵام ئێمە دەرهەق بەمە، وەك ئەوەی لە خەوێکی شیرین و قووڵدا بین، بێدەنگ ماینەوە.

دواتر ئەم دوژمنە هیچ وپووچانە، بەناوی هەڵبژاردنەوە، بە زۆرو تەنگەتاوکردن و لێدان و کوشتن و جنێوپێدان، خۆیان بەسەر خەڵکیدا سەپاند. بەم جۆرە بە شێوەیەکی تاوانبارانە دەستیان کرد بە پەلاماردانی مرۆڤە پاکە بەناموسەکانی ئەم وڵاتە. بەڵام ئێمە دیسان هەر لەناو ئەو بێدەنگییە سەیرو بێجووڵەیەدا ماینەوە.

دنیای شارستانی بەرامبەر بە جوامێری و قارەمانێتیەکەمان لە تەڕابلوس، سەری سوڕمابوو. بەلاّم بە هیچ جۆرێك لە بێدەنگی و بێجووڵەییە سەیرەکەمان لەبەردەم ئیتاڵیەکانی ناوخۆماندا تێنەدەگەیشت و عەقڵی بەم دوو ناکۆکییە نەدەشکا، بەلاّم بەداخەوە !

چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا، جەردەو ڕێگرە ئیتاڵیەکان ویستیان گوشارەکانی خۆیان بخەنە سەر (چەناقەلعە). بەلاّم قارەمان و ڕۆڵە ئازاکانمان وەك هەر جارێکی تر ئەرکە پیرۆزەکانی خۆیان بەجێهێنا.

دواتر ئەم جەردەو ڕێگرانە بۆ ئەوەی تۆڵەی ڕووداوەکانی تەڕابلوس بستێننەوە، هەروەها بۆ ئەوەی ئەرووپا بکەن بەگژی ئێمەدا، (ڕۆدۆس)یان داگیرکرد.

وا دیارە ئەمانە بە شێوەیەکی ترسنۆکانەو بە سوودوەرگرتن لە بێداروباریی هێزی دەریاییمان لە (دەریای سپی) و بێهێزیەکانی ترمان، ئامانجە پیسەکانی خۆیان بەدیدێنن. چ کەسانێکی تر، لەگەڵ ئیتاڵیەکاندا، بوونە هۆی ئەوەی ئەم کارەساتانەمان بەسەردا بێ ؟ لەکاتێکدا دەوڵەتی پیرۆزمان، زیاد لە هەموو جارێکی تر، پێویستیی بە ئاسایش و ئارامی هەبوو، ئەم شتە تالاّنە کە بەرەو نەمان و تێکچوونیان دەبردین، لەبەر کام لایەن هاتنە ئاراوە ؟

پێویستە هیچ گومان لەوە نەکرێ کە پیاوماقوولان و گەورەپیاوانی کۆمەڵەی داماوی ئیتیحادو تەرەقی، لەگەڵ ئیتاڵیەکاندا، بوونە هۆی ئەوەی ئەم کارەساتە دڵتەزێنانە بەسەر وڵاتەکەماندا بێن.

نیشتمان، چاوەڕوانی خزمەتی زیاترو لەخۆبوردوویی زیاتری ئەو عوسمانیەیە کە بە دەیان ڕۆڵەی قارەمانی پەروەردە کردووە، بە

شێوەیەکی خۆبەختکەرانەی خوداپەسندانەوە لەپێناوی پاراستنی وڵاتدا تێدەکۆشان.

بۆ تیمارو دەرمانکردنی برینە قووڵەکانی خۆی، بانگی هەموو ئەو کەسانە دەکات کە خەمی بۆ دەخۆن و فرمێسکی بۆ دەڕژێنن، ڕیشەی ئەو برینانەی وا لە دەرەوە خوێنی لێ دەچۆڕێ، لە دەروونەوەیە، یانی خودی نیشتمانە گەورەکەیە. ڕاستیەکەی، ڕیشەی ئەم نەخۆشییە، هەمان گەندەڵی و خراپەکارییە ! ئەو نەهامەتی و کارەساتانەی وا لە دەرەوە ڕووبەڕوومان دەبنەوە، سەرچاوەی هەمووی، کردەوەی ئیتاڵیەکانی ناوخۆمانە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێشتا بێدەنگییەکەی جاران باڵادەستە ! هەروەك پێشتر سەرقاڵی تەماشاکردنێکی مایەی بێزارین !

شێوازی ئیدارەو چۆنیەتی کاری حکوومەتی ئێستا، بەرەو دوو ئەنجامی خراپمان دەبات: یا ئەوەیە دوایی بۆ خۆڕزگارکردن لەم کۆمەڵە ملهوڕە، پەنا بۆ هەندێك شێوازو ئامانجی ڕووخێنەرانە بەرین، یا بەردەوامیی ئەم شتە دەبێ بەهۆی باڵادەست مانەوەی سیاسەتی دزی و جەردەیی، کە لەباتی ئەنجامدانی ڕیفۆرمی گونجاو بەپێی ناوەڕۆك و ڕۆحی مەشرووتییەت، گەلانی عوسمانی، لەڕێگەی کینەو نەفرەت و پەردەی نەزانییەوە، لە حکوومەت سارد دەکاتەوەو خەزێنەی دەوڵەت چەپاو دەکات !

لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە سیاسەتە نەفرەت لێکراوە، دەبێ بەهۆی دروستبوون و مانەوەی ئاژاوەگێڕو کەس لە کەس و، کارو بەرنامەی گونجاو بۆ زیادبوونی داهات جێبەجێ ناکرێن" هەروەها لەبەر ئەوەی

پۆست و کاره گرنگەکانیش لە دەستی هەندێك کەسی نەناسراوی تازەپێگەیشتووودان، گەندەڵی هەموولایەك دەگرێتەوە.

ئەگەر ئەم کەمتەرخەمیانە هەر بەم شێوەیە بەردەوام بن، لەکۆتاییدا ئەم هێزە هەموو ڕێگاکانی ڕزگاریمان کوێردەکاتەوە.

لەباتی ئەوەی لەم سەردەمەدا کە سەردەمی شارستانی و ئابوورییەکی گونجاوە، گرنگی بە دیاردە تازەکان بدرێ، خەریکە لەڕێی زوڵم و ستەمی جۆراوجۆرەوە، دەوڵەتێکی گەورە لەناو دەبرێ بۆ بەرژەوەندی چوار کەسی هیچ وپووچ.

ئەم کۆمەڵە نەفرەت لێکراوە، بۆ ئەوەی بتوانێ درێژە بە دەسەڵات و حکوومەتەکەی خۆی بدات، پەیتا پەیتا بە ئەندازەیەکی گەورە قەرز دەکات (بە مەرجی دانەوەی بە سوودی زیاتر)و، لەبەر ئەوە کەوتوەتە ناو زەلکاوی خیانەت، ناتوانێ هەڵی ڕاپەڕاندنی ڕیفۆرمی گونجاو بۆ سووککردنی قەرزەکان بڕەخسێنێ. بەم جۆرە، ئەم قەرزانە بوونە هۆی ئەوەی کە نەتوانین نەك تەنیا بەرژەوەندەکانی خۆمان، بەڵکوو سەربەخۆیی ی خۆشمان بپارێزین و، هەر ڕۆژەو لایەنێکی لەدەست بدەین و، ببینە هەراجکراوی بازاڕی سیاسەتی جیهانی.

چۆن دەتوانین، بەم هەموو گەندەڵییە ئیدارییەوە، قەرزەکان و سوودەکانیان بدەینەوە ؟ ئایا ئەمە شیاوە ؟ ئەم ڕەوتە، ئێمەو ئەم وەزعە ئابوورییەی ئێمە بەرەو بێ‌هێزی دەبات و، وامان لێ دەکات ملکەچی دەسەڵاتی ئەورووپییەکان ببین و، جارێکی تر چەقبەستن و نابووتیەکەی ساڵی ١٨٧٧مان لەلا زیندووبکاتەوە. حکوومەتەکانی ئەم سەردەمە، لە ژوورێکی بازرگان و بنەماڵەیەك دەچن، ئەگەر وەزعی ئابوورییان خراپ و

نالەبار بێ، ئەوا بەرەو قەیران و چەقین و نابووتی دەچن و، وایان لێ دێت واز لە داخوازیەکانیان بهێنن و، ئەوانەشیان لەدەست دەربهێنرێ.

نەوەکا ئێمەش چارەنووسێکی وەهامان لەپێش بێ ! ئایا لەکاتی پارچەپارچەو دابەشکرانی وڵاتەکەماندا، لەبەر قەرزکردن لە ئەوروپیەکان، عەقڵمان دێتەوە سەر خۆی و بەهۆش دێینەوە ؟ ئایا بۆ ئەوەی لە گەمە شوومەکانی ئەم کۆمەڵەیە دەرباز بین، دەبێ چاوەڕوانی دەرەنجامێکی وەها بین ؟

دووهەمین شتیش ئەوەیە، کە دورگەکانی دەریای سپی کەوتنە بەر دەستدرێژی ئیتاڵیەکان و، ئێستاش دەیانەوێ داگیریان بکەن.

بارودۆخی سیاسەتی دەرەوەمان، لە هی سیاسەتی ناوخۆمان زیاتر، خراپترو دڵتەزێنترەو، بە هیچ جۆرێك شایستەی ئەم پاشاگەردانییە نییە. خۆی ئەورووپاش، بە شێوەیەکی ئاشکرای بەرچاو، لەبەر بەرژەوەندە تایبەتەکانی خۆی، چاوپۆشی لە کردەوەو دەستدرێژیەکانی ئیتاڵیا دەکات. ئێمە تاق و تەنیا ماوینەتەوە. ئەمە خۆیلەخۆیدا گەورەترین و بەهێزترین بەڵگەیە بۆ شکست و نسکۆی سیاسەتمەدارانمان و، گەڕان بەدوای بەڵگەی ترشیدا جۆرە کەمتەرخەمی و کوێرایی‌داهاتنێکە. ئایا بۆ ڕزگاربوون لەم هەموو خراپییەی کە باسمان کرد، پێویستە بەشێکی خۆشەویستی وڵاتەکەمان، وەك تەڕابلوس و دوورگەکانی دەریای سپی، لەژێر دەستی دوژمناندا ببینین ؟ لەم قۆناغە خەماویەدا، لە ئەنجامی ستەم و گوشاری کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقییەوە، ئیتر چاوەڕوانی بڕیاری خۆڕزگارکردنی گەلی بەناموسی عوسمانی و، تەنانەت دنیای

شارستانیش، لەم وەزعە دەکرا. ئەم ڕێگەیە زۆر سەختو دژوارەو ئازارو خەفەتی زۆری تێدایە، بەرەو نابووتیو تێکچوون دەچێ.

لەبەر ئەم کارەساتانەی کە بەسەرماندا هاتوون، دڵم پڕ خوێنە. من بەشبەحاڵی خۆم هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەم بارودۆخەو کێشەو گرفتەکانیم دا. ئەوە ویژدانم بوو کە بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە قورسو هیوابڕە هانی دام. بەڵام ئەوەش ڕاستییەکە کە هیوا ماڤ کەسانێکە دەیانەوێ بژین.

سەرباری هەموو ئەمانە، ئێمە وەك گەلی عوسمانی کەموکوڕییەکی گەورەمان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بەبێئەوەی تەماشای نەزانییە چەپەڵەکەمان بکەین، زۆر خۆمان بە گەورە دەزانینو، بەخۆنازینێکی لەڕادەبەدەرمان هەیە. کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی"ش، هەر لەبەر ئەوەی کە بەهۆی ئەم غەرڕاییو خۆبەزلدانانە نەزانانەوە دەستی چووبوە ناو خوێنو تاوان، دەرفەتی بەجێهێنانی کاری چاکی بۆ خۆی نەڕەخساند.

دوژمنی ئەوکاتەمان، یانی ئیتاڵیە هیچوپووچەکان، دەستیان بە شەڕ کرد لەدژی ئێمە. لەکاتێکدا ئەم ڕووداوە توندوتۆڵ پەیوەندیی بە ئایندەمانەوە هەبوو، بە کەمتەرخەمیەکەی جارانەوە مامەڵەمان لەگەڵیدا کردو، زۆر بایەخمان پێنەدا.

ئیتاڵیا، سەرەڕای هەموو هیچوپووچیو ترسنۆکییەکی خۆی، یەکێك لە گەورەترین دەوڵەتەکانی دنیای هەبوو. ئەگەر بەڕاستیو بێپەردە باسی خۆشمان بکەین، حکوومەتەکەی ئێمە، بەگوێرەی دنیای شارستانی، سەربەخۆیی تەواوی خۆی دۆڕاندووەو، لەناو ئاژاوەگێڕیدا بەرەو نەمانو نابووتی دەچێ! کەچی ئێمە ئێستاش کە

ئێستایە، سەرەڕای هەموو ئەم شتانە، خۆمان زۆر گەورە دەبینین. تەنانەت لەبەر ئەوەی ئەوەندە شان‌وباڵی خۆماندا هەڵدەدەین، هیچ کەس نزیکمان نابێتەوە.

ئیتاڵیا تەنیا بە داگیرکردنی ڕۆدۆس (Rodos)ـەوە نەوەستاو، هەموو دوورگەکانی دەریای سپیی بە شێوەیەکی خیانەتکارانە خستە ژێر دەستی خۆی. کەچی حکوومەتە داماوەکەی ئێمە، هێشتا خەڵکەکەی خۆی فریو دەدات‌و دەیانخاتە خەو. مەحموود شەوکەت پاشای وەزیری جەنگ، بەر لەوەی ئیتاڵیەکان دوورگەکانی دەریای سپی داگیر بکەن، لە کۆبوونەوەیەکی ڕۆژنامەوانیدا بە قیڕەقیڕەوە ڕایگەیاندبوو: (( تەگبیری پێویستمان بۆ پاراستن‌و بەرگری‌و شەڕ کردووەو، ئەگەر ئیتاڵیەکان بۆ ئامانج خراپی خۆیان دەستدرێژی بکەنە سەر خاکی دوورگەکان، ئەوا تووشی شکستێکی خراپیان دەکەین. بەڵام هەر دوای ئەم ڕاگەیاندنە، ئیتاڵیا دوورگەکانمانی داگیر کردو، هیچ خەبەرێکیش لەو هەراو هوریاو دەنگەدەنگەی بەر لە شەڕ نەبوو. سەرباری ئەوەی کە سەربەخۆیی‌ی ڕاستەقینەی خۆیان لەدەست دابوو، تەنیا شتێك کە دەبوو بە مایەی دڵدانەوەمان، سەرکەوتنە خەیاڵیەکانی خۆمان بوو.

ئایا نیشاندانی ئەم شکستانە بە سەرکەوتن‌و، داپۆشین‌و شاردنەوەی زەرەرو زیانی نەتەوەیی، گاڵتەپێکردن بە خەڵك ناگەیەنێ ؟ هەتا ئەم ئیدارە نەفرەتیە لەسەر کارەکانی خۆی بەردەوام بێ‌و، ئیدارەیەکی دادخوازو نیشتمانپەروەر نەیەتە سەر حوکم، ئەوا نەهامەتیەکانمان ڕوو لەزیادی دەکەن‌و، کارەسات‌و بەدبەختی‌ی

گەورەتریش نزیکتر دەبێتەوە. وەك باسم کرد، ئەگەر حکوومەتێکی دادخوازو مافپەروەر بێتە سەر کارو، لەڕێی کاروباری پەیوەندیەکانی ئەو حکوومەتەوە، بتوانێ پشتیوانیی هەردوو وڵاتی گەورەی ئینگلتەرەو فەڕانسە کە هەمووکاتێك پارێزگاریی مافەکانی دەوڵەتی عوسمانییان کردووە، دووبارە بەدەست بهێننەوە، ئەوا دەتوانێ مافەکان و ناموس و شەرەفی دەوڵەتی عوسمانی بپارێزێ و، کۆتایی بەم شەڕە بهێنێ. بەپێچەوانەوە، ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە دوابەدوای تەڕابلوسی ڕۆژئاواو دوورگەکانی دەریای سپی، ئەلبانیا و مەقدونیەشمان لەدەست دەردەچێ. ئێستا، لەبەر دوژمنانی ئازادیمان، بەناچاری باسی مەترسیی ئەم لەناوچوون و نابووتییە خەماوییە دەنووسم و، ئەمەش زۆر ئازارم دەدات. ئیتر لەوە زیاتر کە بڵێین خودای توانا لە شەڕی تەماعکاریی دوژمنە دەرەکیەکان بمانپارێزێ، هیچ شتێکی ترمان لەدەست نایە.

تائێستا لە هەموو بەرهەمەکانی خۆمدا (بەرهەمی نووسین)، چ ئەوانەی کە تورکین و چ ئەوانەش کە فەڕەنسین، لە هەموویاندا بەڕاشکاوی گوتوومە: ئەم هەموو هەڵانە ئەنجامی خیانەتی حکوومەتە ستەمکارەکەمانەو، ئەوەشم سەلماندووەو، بەردەوام هەوڵی ئەوەشم داوە خەڵك بە پاك و بێتاوان لەقەڵەم بدەم. بەڵام !

ئەگەر ئەم بێدەنگییە قووڵ و دەربڕنە نەبڕاوەیەمان ببێ بەهۆی ئەوەی کە لەکۆتاییدا ئەورووپیەکان هیوایان بە ڕزگاربوونمان نەمێنێ، ئەوکاتە نابووتی و لەناوچوون !

## دواین خیانەتەکان

ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچێ، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، تاجی حەوت سەد ساڵەی پاشایەتی‌ی عوسمانیی، لەڕێگەی ستەم‌و زۆرەوە، خستوەتە دەستی هەندێك کەسی بێ‌خێرو هەموو توانایی‌و هێزێکی ئەم وڵاتەی پێ تەفروتوونا کردووە. جێی باسە، ئەم ماوەیە نەهامەتی رووی کردە هەموو بنەماکانی ئەم وڵاتەو تێکی دان. لە ناوەوەو دەرەوە، دوابەدوای یەك، رووبەرووی کارەسات‌و نەهامەتی بووینەوە. ئەم وەزعە گەیشتوەتە ئەو ئاستەی کە هەموو دنیا چاوی بڕیوەتە گۆشەیەکی ئەم وڵاتەو خۆی ئامادەی پەلاماردانی کردووە. ((خودا خۆی بەزەیی‌ی بێتەوەو، نیشانەکانی لەناوچوون‌و نابووتی لە هیچ جێگەیەك نەخاتە روو)).

کاتی خۆی چەندەها جار باسی ئەم چارەنووسەم کردووەو، هەوڵیشم دابوو سەرنجی خەڵك رابکێشمە سەر ئایندەو ئامادەیان بکەم بۆ ئەم کارەساتانە. زۆر پێشتر لەوەی کە ئیتاڵیەکان بە جەردەیی‌و رێگری‌ی خۆیان هەوڵی بەدیهاتنی ئەم ئامانجە خراپانەیان بدەن، بە زمانێکی توندی رەخنە پێشبینی‌و باسی قەومانی ئەم کارەساتەم کردبوو بۆ لایەنی بەرامبەری خۆم. بەڵام کێ بە کێیە، هەر کەسەو بەپێی بەرژەوەندەکانی خۆی خەریکی تۆمەتبارکردن‌و تاوان بوو و، کەس گوێی لەمە نەدەگرت.

تاوانبارترین کەسانی ڕووداوی شەڕی عوسمانیو ئیتاڵیا، دوای ئەو هەموو بەدکاریو سووکایەتیەی خۆیان، دیسان وەك جاران نەیاندەتوانی بەبێ خراپەکاریو گەندەڵی ئیدارە بکەن. ئەمانە لەلایەکەوە جۆریەجۆر باسی ڕووداوی شەڕەکەیان دەکردو، دەیانویست ناوەڕۆکی ڕووداوی شەڕەکە بە فریودانی خەڵك بشارنەوە. لەلایەکی ترەوە تەنیا بەمەوە نەدەوەستانو لەنێو خەڵکدا بڵاویان دەکردەوە: گوایە من لەسەرەتاوە تائێستا شەڕی ئیتاڵیەکانم بەڕێوە بردووەو، فەرماندەیی گشتیی سوپای ئیتاڵیا بەپێی ڕاسپاردەو زانیاریەکانی من جووڵاوەتەوە. پێویستە بڵێم: بە هیچ جۆرێك ئەم شتانەیان دوانەدەخستو، یەکسەر لەڕێگەی بەیاننامەو بڵاوکراوەی جیاوازەوە لە هەموولایەکی وڵاتدا بڵاویان دەکردەوە. ئەویڕاستیبێ، ئیتر تەنیا تاکەکەسێکیش نەماوە نەزانێ ئەم فریودانو هەڵخەڵەتاندنە چ جۆرە ناوەڕۆکێکی گەندەڵو گڵاویان هەیە. ئایا ئەو کەسە شەڕەنگێزو خراپەکارانەی کە دەوڵەتی ئیتاڵیایان بەسەر وڵاتی عوسمانیدا زاڵ کرد، هەر ئەوانە نین کە ئێستا ئیدارەی دەوڵەتیان لەدەستدایەو، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی پشتیان دەگرێ ؟ ئایا هەر ئەمانە نەبوون تەڕابلوسە بێچارەکەیان بێهێز هێشتەوەو، بەو جۆرە ویستو پاوانخوازیی ئیتاڵیەکانیان وورووژاند ؟ پرسیارێکی تر لێرەدا ئەوەیە: مرۆڤێك ڕەخنەی لەم هەموو شتانە گرتووەو، کاتی خۆی ئەمانەی خستۆتە بەردەم پرسیار، چۆن دەبێ ئێستا هاوبیریو هاوکاریی دوژمن بکات ؟

کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، لەباتی ئەوەی ئەم جۆرە تۆمەتە نابەجێیانە بخاتە پاڵ ئەمو ئەو، با حیساب لە کەسانی وەك "ماتیرە

سالەم"و "نەسیم ڕووسۆ"و "قەرەسوو"[٤٩] بپرسێتەوە کە گەورەترین زیان و زەرەریان لەم وڵاتە داو تووشی نەهامەتییان کردووە.

هەڵبەت، من دڵنیام ڕۆژێك حیسابی ئەم بوودەڵەیی و هیچ وپووچییەیان لێ دەپرسرێتەوە. ئایا ئەوکاتەش کەسانی خاین و بێتاوان ناخرێنە ڕوو ؟ لە سەددا سەد ! ڕۆژێك دێت دادی هەمیشەیی بکەوێتە مەیدانەوە. ڕۆڵە قارەمانەکانی وڵاتی عوسمانی لەلایەکەوە

---

[٤٩] ئیمانووەل قەرەسوو، لە سەلانیك لەدایك بووە. ساڵی ١٩٣٤ لە (تیرەستا)ی ئیتاڵیا کۆتایی بە ژیانی هاتووە. سیاسەتمەدارێکی یەهوودیی وڵاتی عوسمانی بووە. کاتێك لە سەلانیك پارێزەر بووە، بووە بە ئەندامی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی. پەیوەندیی لەنێوان ماسۆنەکان و کۆمەڵەدا بەرقەرار کردووەو، بۆ ئەوەی ئەوانە یارمەتیی ماددیی کۆمەڵە بدەن. دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم، بوو بە ئەندامی (مەجلیسی مەبعووسان)و، لەنێو ئەو دەستەیەدا جێی خۆی کردەوە کە لەسەرکارلابرانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمیان ڕاگەیاند. ساڵی ١٩١٢ دووبارە لە سەلانیك و ساڵی ١٩١٤ش لە ئەستەنبووڵ بوو بە نوێنەرو چووە پارلەمان.
لەکاتی یەکەم شەڕی جیهانیدا، کاری لێپرسینەوەی خۆراك و خواردەمەنیی گشتیی ڕادەپەڕاند. دەڵێن: لەکاتی بەڕێوەبردنی ئەم کارەدا، گەندەڵییەکی زۆری کردووەو پارەیەکی زیادی کۆکردوەتەوە. دوای شەڕی مۆندرۆس و، پاش ئەوەی وەك تاوانبارانی جەنگ بەدوای لێپرسراوانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرقیدا دەگەڕان (١٩١٨)، ئەویش بەدزییەوە ڕای کردە ئیتاڵیا. قەرەسوو، سەرکردەیەکی یەهوودییەکانی زایۆنیزم بوو لە تورکیاو، هەوڵێکی زۆری دا بۆ جێگیرکردنی یەهوودیەکان لە فەلەستین.
لە سەرووی هەموویانەوە، تەلعەت بەگ و ژمارەیەکی زۆر لە لێپرسراوانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ئەندامی ئەو ماسۆنیەتە بوون کە قەرەسوو مامۆستایی دەکرد. "مایترە سەلام"یش یەکێکە لەو کەسانە کە نەخشێکی بەرچاوی لە کاریگەربوونی زایۆنیزم لە تورکیادا هەبووەو، سەرۆکی بانکی نەتەوەیی عوسمانیش بووە.

دەرسێکی جوامێرانەی ئیتاڵیەکان دابدەن و، لەلایەکی تریشەوە خاینان و ئیتاڵییە ناوخۆییەکانیش لەنێو ئاگری کینەو نەفرەتی خۆیاندا بسووتێنن. دەرنگ و زوو کەوتووە، بەڵام لەکۆتاییدا هەر کەسە هۆشیارو بەئاگا دەبێتەوە.

ئەم هەڵبژاردنانەی دوایی کە وەك بەزۆرەملا خۆدانان بوون، تا چەندە دەرفەتی دابێتە کۆمەڵەی گەندەڵی ئیتیحادو تەرەقی، بەو ئەندازەیەش سەرکەوتنێکی خراپی پێبەخشین. سەرکەوتنی ئەمانە، لە باری نابووتی و لەناوچوونی گشتیمانەوە، ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. ئەو تاوانانەی کە لەم دواین هەڵبژاردنانەدا کران، بوون بەهۆی بەرزبوونەوەی دەنگی نارەزایی لەناو خەڵکداو پڕ گرێ وگۆڵتربوونی بارودۆخەکە، کە ڕێی تێدەچێ بە ڕاپەڕین بتەقێتەوە. جا کە وابوو، وای بە حاڵی ئەو نوێنەرانەی ئەنجومەن ! ((کە بەزۆر دیاریکراون))و، ئەو حکوومەتەی کە دێتە سەر کار ! ئێمە ئەوکاتە، لە هەموو کاتێکی تر زیاتر، پێویستیمان بە حکوومەتێکی شەرەفمەندو ئازادیخوازو لەسەرخۆ هەبوو. بەڵام مخابن ! ئەم گرووپە پیسە پاوانخوازە ئەم ئارەزوەشی بە جوانەمەرگی بۆ خستینە ناو گۆڕو وڵاتی عوسمانیشی گیرۆدەی لێقەوماوی و بێچارەییەکی سەیر کرد. یەکەم هەڵبژاردنیش، هەرچەند بە ئەندازەی ئەمەی ئێستا نەبووبێ، دیسان هەر فێڵیان کرد. ئەوەبوو دوایی ئەنجامەکەشمان بە چاوی خۆمان بینی. دەتوانرێ چ کارێك بەو ئەنجومەنە بکرێ کە ڕەنگی خەڵکی پێوە نییەو پڕ بووە لە فەرمانبەری وەزیفەدار ؟ ئێمە بڕوامان وایە، کە داهاتوویەکی نزیك ئەمەمان بۆ ساغ دەکاتەوە.

# لەبەردەم ویژداندا

سەرەتا باسی ئەوە دەکەم کە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بە سەرشێتییەکی سەرسوڕهێنەوە دەوڵەتی عوسمانیی پەرێشان کردووە. من بە شێوەیەکی نەترسانەو بە بارێکی ڕۆحیی پڕ لە خەفەتەوە بەرامبەر بە هەموو ڕووداوێکی چاوەڕوانکراو، باسی ئەوەشم کردووە کە بەژەوەندە نەتەوەییەکانمان لە مەترسیی کەوتنە ناو هەڵدێرێکی خراپیدان. لەڕاستیدا، ئەو هەموو کارەساتانە، بە خراپییەکانی خۆیانەوە، قەومان. کارەساتە دڵتەزێنە مایەی شەرمەزارییەکانی کوژرانی حەسەن فەهمی و ئەحمەد سەمیم و زەکی بەگ[٥٠] بەرودوا هاتنە ئاراوە. زەکی بەگ کە پیاوێکی ئازادو بەجەرگ بوو، بوو بە

---

[٥٠] زەکی بەگ، ساڵی لەدایکبوونی نازانرێ، بەڵام ساڵی ١٩١١ لە ئەستەنبوڵ کۆچی دوایی کردووە. یەکێك بووە لە ڕۆژنامەنووسانی قۆناغی مەشرووتییەتی دووهەم. بۆ یەکەمجار لە ڕۆژنامەی "میزان"ی "مورادی میزانجی"دا دەستی بە کاری ڕۆژنامەنووسی کردووە. لە ڕۆژنامەی "دنیای عموومییە"شدا، ئەرکی جۆراجۆری وەرگرتووە.
لە قوتابخانەی مەرجان و کولێژی زانستی ئیدارەی سیاسیدا وانەی زمانی فەرەنسیی دەگوتەوە. دوای ڕووداوەکانی ٣١ی مارت، دەستگیرکراو، پاش ئەوەی دادگای دیوانی جەنگ موحاکەمەی کرد، بە بێتاوان لەقەڵەم درا. بەڵام دواتر لەبەر ئەوەی بابەتی لەدژی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەنووسی، لە (باقر کۆی) تیرۆر کراو گیانی دەرچوو.

نیشانەی گوللەکانی دڕندەیەك، یا بە شێوەیەکی تر، بوو بە مەرامی کینەو تووڕەیی‌ی کۆمەڵەی دڕندەی ئیتیحادو تەرەقی. بە دەرنەکەوتنی چارەنووسی (تەرابلوس)ی ڕۆژئاواش ئەوە کەوتە ڕوو کە ئەم هەموو خراپەکاریە بێکۆتاییانە، چیبیان بەسەر ئەم وڵاتە ویران‌و نەتەوە لێقەوماوەدا هێناوە.

ئێمە کاتی خۆی باسی هەموو ئەمانەمان کردبوو. بەڵام، ڕاستیەکەی، بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕاستی نەبینێ‌و نەزانێ دادوماف کامەیە، پێویستە وەك دوژمنە ناسراوەکانمان، لە باری بوون‌و بیرەوە، داماوو بێچارەو چاوبرسی‌و سووك بێ.

نەخوازەڵڵا ! ئەگەر ئەم بارودۆخە تا سێ مانگی تر هەروا بەردەوام بێ، ئەوکاتە جێگایەك لەنێو ئەورووپییەکاندا نامێنێتەوە بۆ ژیانی عوسمانیەکان. ئەگەر لە هەموو ژیانی تایبەت‌و گشتی‌ی خۆماندا، لەو بێچارەیی‌و داماوی‌و پرتەوبۆڵەیە ڕزگارمان نەبێ‌و، چارەنووسی خۆمان بنێینە ناو چنگی هەندێك کەسی هەرچی‌وپەرچییەوەو چاوەڕێ بین، ئەوا ئێمەو وڵاتی بێچارەی عوسمانی هیچ ئومێدێکی ڕزگاربوونمان لێ ناکرێ. ئایا چاوەڕێکردنی پاراستنمان لەلایەن ئەم حکوومەتە ستەمکارەوە، خۆی‌لەخۆیدا گێلی‌و گەمژەیی نییە ؟ ئەم زوڵم‌و زۆرداری‌و هەژارییەی کە باڵی بەسەر وڵاتەکەماندا کێشاوە، تەنیا لەو حکوومەتانەدا بەرچاو دەکەوێ کە بەرەو تێکچوون‌و نابووتی دەچن.

پڕ نازارترین‌و تاڵترین شت کە لەپێناوی ئارەزووی نیشتمانپەروەرانەو خەباتمدا بۆ ڕزگاری‌ی نیشتمان‌و هاووڵاتیانم بەدەست کۆمەڵەی شاراوەو ستەمکاری ئیتیحادو تەرەقی‌یەوە تووشم

هاتووە، ئەوەیە کە هەندێك کەسی بێڕەوشت، بەناوی هاوڕێیەتییەوە، لەگەڵمدا هاتوونەتە مەیدانی ئەم کارانەو، ویستوویانە خیانەتم لێ بکەن‌و، لەپشتەوە خەنجەرم لێ بدەن. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، بەرامبەر بە زۆرداری‌و پەلامارو زەبروزەنگی نەیارانم کە ڕۆژبەڕۆژ ڕووی لەزیادبوون دەکرد، تەنیا ساتێکیش تووشی بێ هیوایی‌و سستی‌و چۆکدادان نەبوومەو، نابم. بەڵام لەناو ئەمانەدا، ڕاست لەبەر ئەوەی کۆنەدۆستێکم کە ماوەی پانزە شانزە ساڵ زیاترە پێکەوە دۆستین، پشتی تێکردمو، لەبەر بەرژەوەندی خۆی، سەری بۆ کۆمەڵەی ئیتیحادی تەرەقی دانەواند. هەرچەندە تووشی بێهیوایی نەبووم، بەڵام دوچاری خەفەتێکی زۆری کردمو سەرم سوڕ ما.

ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەبوو کە ئەم دۆستە بە کەسێکی خراپ‌و هیچ‌وپووچ‌و لە باری ویژدان‌و عەقڵەوە بێچارە دەرچووبوو. ئایا لەبنەڕەتدا چاوەڕێکردنی پاکی‌و ڕاستگۆیی لە منداڵێکی نانکوێر کە درێغی دەکات‌و کەمێك چاکە دەرهەق بە باوکیشی لێ ناوەشێنێتەوە، شتێکی زۆر نییە ؟ کاتی خۆی ئەم کوڕە لە ئەورووپا بوو، باوکی هەر مانگێك بە سەدان لیرەی بۆ دەنارد. بەڵام کاتێك باوکی پەکی کەوت‌و لێی قەوما، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ باوکیدا پچڕاندو، هەڵوێستێکی وەهای نواند کە بەڕاستی مرۆڤ نازانێ چۆن‌و بە چ شێوەیەك هەڵیسەنگێنێ. ئەو کەسانەی من بەوە تاوانبار دەکەن کە دەمەوێ ناوی خۆم دەربخەمو پلەوپایەپەرستم، تەنیا بۆ ئەوەی پاکانەی هەموو تاوان‌و کردەوە پیسەکانی خۆیان بکەن، ئاوا تۆمەت دەخەنە پاڵ من. منیش لە هەموو هەلێکدا باسی ئەوەم کردووە کە

ئەگەر ئەم وڵاتو نەتەوەیە بە نموونەی هەرە بەرزی خۆی، واتە مەشرووتییەت، گەیشت، ئەوکاتە من داوای هیچ شتێك ناکەمو چاوەڕوانیش نابم.

لەکاتێکدا زۆربەی گەلی عوسمانی بە شێوەیەك، کە گەیشتبوە ئاستی پەرستن، لایەنگریی لە کۆمەڵی ئیتیحادو تەرەقی دەکرد، من بە هەموو لەخۆبردوویی‌و هەستی نیشتمانپەروەرانەی خۆمەو، لەڕوویدا ڕاوەستامو دەستم بە شەڕ کرد. هەرچەندە تەنیا بوومو بەتەنیایی دەستم بە خەبات کردبوو، کەچی هیچ کاتێك هیوام بە داهاتوو کەم نەبووەوە. هەروەها لەوە دڵنیابووم کە گەلی عوسمانی تایبەتمەندییەکی شاراوەی هەیەو هەمووکاتێك ئامادەی گۆڕانکاری‌و پێشکەوتنێکی چاکە. بۆیە ئەگەر ڕۆشنگەری لە ئاستی تێگەیشتی گشتیدا بێتە گۆڕێ، ئەوا وردەوردە ویژدانی تاکەکانیش ڕوون دەبێتەوە. زۆر شوکر کە ئەم ئارەزوە پیرۆزەی خۆمم بەدیهێنا. ئەمڕۆش سەرەڕای هەموو درۆو دەلەسەیەك، زۆربەی خەڵك لایەنگری لە مافو دادو ئێمە دەکات.

پێویستە ئەو کەسانەی کە تائێستا هەمووشتێکیان بۆ هەڵدەبەستین‌و تۆمەتیان دەخستە پاڵمان، لەم بڕیارەی ڕای گشتی شەمەزار بن کە دەرهەق بە ئێمەو بە قازانجی داویەتی.

کەسانێکی زۆر هەبوون بە چاوێکی خراپەوە دەیانڕوانییە ئەم خەباتەی ئێمەو، سەرزەنشتیان دەکردین‌و، تەنانەت ئاستەنگیشیان بۆ دروست دەکرین. بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیانتوانی کارێکی خراپ بکەنە سەر ئەم خەباتە نیشتمانییەمان. هەموو هەوڵ‌و تێکۆشانێکی من، بۆ ئەوەیە کە هاتنە سەرکارو دەسەڵاتی ئیدارەیەکی یاسایی ببینم. تەنیا

ئەمە دەتوانیٚ من لەم خەباتە پەشیٚمان بکاتەوە. ئەوکاتەی ستەمکاران و پاوانخوازان واز لە یاریکردن بە چارەنووسی نەتەوەییمان بهیٚنن، ئەوسا ئەم هەموو خەبات و هەراوهوریایەش نامیٚنن و، بە ئاسایش و ئارامی جیٚی خۆیان دەگۆڕنەوە. من کارم بە تاکە کەسەکانەوە نییە، بەڵکوو خەریکم قەرزی خۆم دەدەمەوە بە نیشتمان و ئەو خاکە کە لیٚی پەیدا بووم. تەنیا پاداشتی منیش ئەوەیە کە دوای ژیانیٚکی پڕ لە خزمەت، هەر لەو خاکەدا بمنیٚژن.

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بهیٚنم، بە پیٚویستی دەزانم لەبەردەم ڕۆحی شەهیدانی ڕیٚگەی ئازادیی نیشتماندا، سەری ڕیٚزو حورمەت دانەویٚنم و، یادی شەهیدانی زیرەك و لیٚهاتوو حەسەن فەهمی و سەمیم و زەکی بەگ بکەمەوە.

لەکۆتاییدا، دەمەویٚ بە هاوولاٚتیانم بلیٚم: ((هاوولاٚتی، ئەگەر پیٚویست بکات لەپیٚناوی نیشتمان و مەشرووتییەتدا بمرە. ئەوکاتە میٚژوو بە ڕیٚزو حورمەتەوە یادت دەکاتەوە. تەنیا بۆ ساتیٚکیش دوور مەکەوە لە دادو ڕاستی، بەپیٚچەوانەوە، زیان بە ولاٚتەکەت دەگەیەنی. تەرابلوسی بەدبەخت و بیٚچارە، نموونەیەکی تاڵ و بەئازار ئەمەیە.

تشرینی یەکەمی ١٩١١

شەریف

# پرۆگرامی
# پارتی ڕیفۆرمی بنچینەیی‌ی عوسمانی

١. حکوومەتی عوسمانی، حکوومەتێکی مەشرووتەیە، کاروباری خۆی، بە چاودێری‌ی هێزێکی هاوبەشی یاسادانانی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵك‌و ئەنجومەنی پیاوماقوولان (سناتۆ) بەڕێوە دەبات.

٢. هەموو خەڵکی عوسمانی، لە هەر پێکهاتەو ڕەگەزو ئاینێك دەبن با بن، تێکڕا ئازادانە لەدایك دەبن‌و، ئازادانەش دەژین. هەروەها هەموویان خاوەنی ماف‌و ئەرکی یەکسانن.

٣. زمانی ڕەسمی‌ی حکوومەتی عوسمانی، تورکییەو، دینەکەشی، ئیسلامە. بەڵام لەگەڵ ئەمەدا پێڕەوانی دینەکانی تریش دەتوانن بەپێ‌ی یاسای تایبەت بە دینەکانی تر مافیان هەبێ‌و بوونی خۆیان بپارێزن.

٤. هەموو مافەکانی پاشایەتی، بەپێ‌ی یاسای بنچینەیی، ئاشکراو جێبەجێ دەکرێن.

٥. ئەگەر فێڵ‌و ساختەکاری لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل‌و ئەنجومەنی پیاوماقووڵاندا کران، بڕیاری هەڵوەشانەوەیان دەدرێ‌و، بەپێ‌ی بنەماکانی ئازادی‌ی بیرو بۆچوون‌و ویژدان، هەڵبژاردنی تر دەکرێتەوە.

٦. دووبارە ڕێخکستنەوەی یاساکانی هەڵبژاردن، بەپێ‌ی نیازە بنەڕەتەکانی وڵات. ئەنجومەنی پیاوماقووڵان، هەر نۆ ساڵ جارێك،

هەڵبـژاردنی خـۆی تـازە دەكاتـەوەو، نیـوەی ئەمانـە پادشـاو نیوەكـەی تریش خەڵك هەڵیدەبژێرێ. جێی باسە، ئەم ئەنجومەنە بە چاودێریی دەستەی وەزیران كاردەكات. بۆچوونی گرووپەكەی ئێمـە، سـەبارەت بـە هەڵبژاردن، ئەوەیە كە ڕای گشتی بە بنچینە وەربگیرێ.

٧. گۆڕانكـاری لـە یاسـای بنـچینەیـیی وڵاتـدا، بـەپێی یاسـاكانی كۆمەڵگەی شارستانیو سەردەمو، گۆڕانی یاسـاكانی دادیـش، بـەپێی نیازەكانی نەتەوەكەمانە.

٨. خـەڵك سـەرچـاوەی دەسـەڵاتە. هـەر لەبـەر ئـەوە، هـیچ كـەسو گرووپو لایـەنێك ناتوانـێ بـەبێ ڕەزامەنـدیی خـەڵك هێـزو دەسـەڵات بخاتە دەستی خۆی.

٩. خـەڵك، مـافی ئـەوەیان هەیە لـە چۆنیەتی كاروبـاری بـەڕێوەبردنی هەر وەزیفەدارێك بكۆڵێتەوەو، لێی بپێچێتەوە.

١٠. هـیچ گـرووپو كۆمەڵـەو لایـەنێك، لـە دەرەوەی ئـەو سـنوورانەی كـە یاسای بنچینەیی دایناون، بۆی نییە دەست لە كاروباری حكوومی وەربدات.

١١. هەمووكەسێكی وڵاتی عوسمانی، بەمـەرجی زیـان نەگەیانـدن بـە مـافی كەسـانی تـر، لـە كردنـی هـەموو كارێـك ئـازادەو، تـەنیا یاسـاش دەتوانـێ سـنووری ئـەم مافانــە دیـاری بكـات. سـەرەكیترین مافـە سـەرەتاییو سروشـتیەكانی مـرۆڤیش ئەمانـەن: ئـازادی، مـافی خاوەنـدارێتی، ئاسایـشی ماڵو گیان، مافی ناوەدەركردنو دژایەتیكردنی زوڵمو ستەمكاری.

١٢. ئـازادیی بـیرو بۆچـوونو خوێندنـەوە، یەكێكـە لـە بایەخـدارترین مافەكانی مـرۆڤ. بۆیـە هـەر كەسێكی وڵاتـی عوسمـانی، بە مـەرجێك پێوانەی دیـاریكراوی یاسـایی تێنەپـەڕێنێ، مـافی ئـەوەی هەیـە ئازادانـە بنووسـێو

بڵێ و شت چاپ بکات. لەبەر ئەمە، پێویستە یاساکانی ئازادیی ویژدان، ئازادیی کۆبوونەوە، ئازادیی قەڵەم و یاساکانی ڕاگەیاندن، بەپێی یاسای وڵاتە پێشکەوتووەکان، بگۆڕدرێن و ناعەدالەتیەکانیان نەمێڵرێ.

١٣. پاکانەکردن و موحاکەمەکردنەوەی ئەو کەسانەی کە بەپێی یاساکانی داد موحاکەمە نەکراون، یا بە خوت وخۆڕایی و بۆ خۆشیی هەندێك لایەن تاوانبار کراون.

١٤. دەرکردنی یاسایەك بۆ ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی گەندەڵی و بەکارهێنانی چەواشەکارانەی دەسەڵات و دیاریکردنی ئەوەی کە ئیدارەی دادگای باری شارستانی دەتوانێ لەوبارەیەوە ئاگاداری بۆ گومانلێکراوان بنێرێ.

١٥. قەدەغەکردنی هەرجۆرە ئەشکەنجەیەکی دڕندانەو، دەستدرێژیکردنە سەر شوێنی نیشتەجێبوونی تاکە کەسەکان و، گوێگرتن لە پەیوەندیەکانیان (پەیوەندیی تایبەت).

١٦. ناتوانرێ هیچ کەسێك، بەدەر لەو چوارچێوەیەی کە یاسا دایناوە، بەپێی هیچ بنەمایەکی تر، دەستگیرو تاوانبار یا زیندانی بکرێ. ئەو کەسانەی کە فەرمانی نابەجێ و بێبنچینە دەدەن و جێبەجێی دەکەن، گەورەترین جۆری سزا وەردەگرن. بەڵام ئەو کەسانەی کە بەپێی یاسا بانگ دەکرێن، یا بڕیاری دەستگیرکردنیان دەردەچێ و سەرپێچیی لێ دەکەن، بە تاوانبار لەقەڵەم دەدرێن.

١٧. بەبێ ئەوەی تاوانی ئەنجامدراو دیاری بکرێ و گومانلێکراو بەپێی یاسا دەستگیر بکرێ، هیچ کەسێك سزا نادرێ. هەروەها تا ئەوکاتەی یاسا کەسێك بە تاوانبار دادەنێ، هەموو کەسێك بێتاوانە.

١٨. ياسا، تەنیا ئەو کردەوانە قەدەغە دەکات کە زیانیان بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەیە. وەك چۆن کردنی کاری قەدەغەنەکراو، یاسا ڕەتی ناکاتەوە، بە هەمان شێوە، هیچ کەسێکی ناچاری کردنی کارێك نییە کە یاسا ڕێی پێنەداوە.

١٩. یاسا، ویست و داوای گشتی دەردەبڕێ. هەر تاکێکی وڵاتی عوسمانی، ڕاستەوخۆ یا لەڕێی نوێنەرەکانیانەوە، ماف بەشداریکردنی لە نووسینی ئەو دەستوورو یاسایانەدا هەیە. هەموو یاسایەك، چ ئەوانەی بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانی دانراون و، چ ئەوانەش کە بۆ سزادان دانراون، پێویستە لەلای هەموان ڕوون و ئاشکرا بن.

٢٠. هیچ کەسێك، بە مەرجێك ئاسایشی گشتی کە یاسا دیاریی کردووە، تێك نەدات، لەسەر بیرو بۆچوونەکانی بەرپرس نابێ و سزا نادرێ.

٢١. بوونی گرووپی سیاسیی جۆراوجۆر، لە حکوومەتە مەشرووتیەکاندا، شتێکی پێویستە. لەبەر ئەوە، هەر کەسێکی وڵاتی عوسمانی ماف پێکەوەنان و دروستکردنی گرووپی سیاسیی هەیە، بەڵام پێویستە پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی خۆی پێشکەش بە لێپرسراوانی دیاریکراو بکات.

٢٢. لەبەر ئەوەی ئەم سەردەمە (سەردەمی ئابووری) سیاسەتی یەکلایەنەی هاوبەشمان هەیە، تا پەیمان ببەستین و بەرە پێك بهێنین. بۆچوونی گرووپەکەی ئێمەش لەم بارەیەوە، ئەوەیە کە بازنەیەکی پەیوەندیی سیاسی لەگەڵ فەرنسا و ئینگلتەرەدا دروست بکرێ.

٢٣. بەگشتی، هەموو پەیمانە ناونەتەوەییەکان پەسند دەکرێن.

٢٤. بۆ ئەوەی یاسایەکی گونجاو بۆ وەرگرتنی باج بێتە ئاراوە، پێویستە وەزارەتی دارایی یاساکانی دارایی‌ی ئەورووپا ڕەچاو بکات.

٢٥. هەر تاکێکی وڵاتی عوسمانی، پێویستە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ لەڕێی نوێنەرەکانیەوە، ئاگای لە چەندایەتی و چۆنایەتی‌ی ئەرکە گشتیەکان بێ.

٢٦. پێویستە هەموو ڕێکخراوێکی شاراوە، بە هەر ناوێکەوەو لەڕێگەی هەر کەسێکەوە بێ با ببێ، قەدەغە بکرێ. یاسا ڕێ بە کۆکردنەوەی هەرجۆرە یارمەتییەکی گشتی کە حکوومەت ئاگای لێ نەبێ، نەدات.

٢٧.لەبەر ئەوەی پارێزگاری‌ی ماڵ‌و موڵك بەرامبەر بە هەر جۆرە دەستدرێژییەك، یەکێکە لە مافەکانی مرۆڤ، هیچ کەسێك، بەبێ هۆیەکی یاسایی، لەم مافە بێبەش ناکرێ.

٢٨. لە جێگەیەکدا کە مافە سروشتی‌و شارستانیەکان دیاریکراو نەبن‌و نەپارێزرێن، مەشرووتییەت بێمانایە.

٢٩. لابردنی پلەی ئیداری‌و گۆڕینی وەزیفەی سەدری ئەعزەم بۆ سەرۆکایەتی‌ی ئەنجومەنی وەزیران، لەڕێی سیستەم‌و یاسایەکی تایبەتەوە دەبن.

٣٠. پێویستە ئەندازەی باجی موڵك‌و زەوی‌و دوکانی کرێ‌و شوێنی کار، بەپێی نەریتی دەست نیشانکردنی سنوورەکانی لەلایەن دەوڵەتەوە (گادسترۆ)، دیاری بکرێن.

٣١. بۆ ئەوەی کاروباری دائیرەی ڕەگەزنامە تێکەڵ‌و پێکەڵ نەبێ، پێویستە هەر تاکە کەسێك بەناوی بنەماڵەیەکەوە بناسرێ‌و، وەهاش تۆمار بکرێ.

٣٢. سەرلەنوێ ڕاپەڕاندنەوەی ئەو کاروبارە عەسکەری و ئیداریانەی کە بەپێی ئارەزوو و لەسەرخۆ کراون.

٣٣. قەدەغەکردنی دەست تێوەردانی سەربازو سوپا لە کاروباری ساسیداو، ڕێگرتن لەوەی کە یەك کەس هاوکات دوو ئەرکی سیاسی و عەسکەریی هەبێ. سەرباز یا ئەندامێکی سوپا، بەبێ ئەوەی خانەنشین بێ، یا واز لە کاروبارەکەی بهێنێ، پێویستە نەهێڵرێ جێ لەناو کاروباری لێپرسراوێتی و ئیداریی هەرێمی و سیاسیدا بگرێ و، دابمەزرێ.

٣٤. ئەنجامدانی ڕیفۆرم لە کاروباری پەروەردەو کولتوورو شێوەی وانەگوتنەوەدا، بەپێی ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە نەتەوەکانی تر پەسندیان دەکەن. پێویستە هەموو یەکێکی عوسمانی خوێندنی سەرەتایی تەواو بکات. دەبێ دەرسە ڕەسمییەکانی پۆلەکانی سەرەتایی و کۆتایی و خوێندنی بەرز، بەپێی بەرنامەیەکی باش بگۆڕدرێن. سەبارەت بە قوتابخانەی ناموسڵمانانیش، پێویستە بەپێی داب و نەریتی باو لەکۆنەوە هەڵسوکەوت بکرێ. بەڵام لەهەمان کاتدا، دەبێ بەرنامەکانی ئەو قوتابخانانە بە لێپرسراوی تایبەتی ئەو بەشە ڕابگەیەنرێن.

٣٥. دامەزراندنی دەزگای هەرەوەزی بۆ یارمەتیدانی بێستانەوان و کرێکا و ڕەنجدەران، بۆ ئەوەی بتوانن کەڵك لە سەرچاوە سروشتییەکانی وڵاتەکەمان وەربگرن.

٣٦. لەبەر ئەوەی تەنیا شتێك کە ئەمڕۆ ئێمە بازرگانیی پێوە دەکەین، بەرهەمەکانی کشتوکاڵە، سەرەتا پێویستە ڕێگەکانی بەرهەمهێنان سەرلەنوێ ڕێك بخرێنەوە. هەروەها پێویستە هێڵی

شەمەنەفەر، بەپێی هەلومەرج و توانایی، دروست بکرێ و، هەوڵی دامەزراندنی کۆمپانیای کەشتی ی عوسمانی بدرێ. واتە لەبەر ئەوەی ئامرازەکانی گواستنەوەو هێنان وبردن بەسوودن، نەك هەر بۆ کاروباری کشتوکاڵی، بەڵکوو بۆ کاروباری عەسکەریش، دەبێ لەم بارەیەوە درێغی نەکەین لە هەرجۆرە فیداکاری و لەخۆبوردنێك.

٣٧. پێویستە زۆربەی کاروبارەکان بە قازانجی جووتیارو وەرزێران بشکێنەوە. بەڵام دەبێ بەرژەوەندو بەشی خەزێنەی گشتیش لەبەرچاو بگیرێ.

٣٨. دابەشکردنی زەوی ی بەکارنەهێنراوو زەویەکانی دەوڵەت، بەسەر هەژاران و ئاوارەو کۆچەراندا.

٣٩. بەستنی پەیمانێك بۆ ئەوەی خەتی بازرگانی ی نێوان عیراق و ئەدەنەو ئەزمیرو قۆنیە بۆ زیادبوونی داهاتی حکوومەت ئاوا بکرێتەوەو، بانکی کشتوکاڵیش لەم بارەیەوە دەستەبەر بێ.

٤٠. بۆ ئەوەی یاسای باج وەرگرتن باشتر بکرێ، پێویستە گونجاوترین و ماقووڵترین یاساکانی دنیا ڕەچاو بکرێن.

٤١. بۆ ئەوەی دارستانەکانی ناخۆو دەوروبەری وڵات بپارێزرێن، پێویستە دائیرەی داهات ئەرکی پاراستینان بخاتە ئەستۆ، کاروباری برینی دارەکانیش بەپێی بەرنامەیەکی گونجاو بەڕێوە بچێ. هەروەها دەبێ کەڵك وەرگرتن لە کانزای دۆزراوەو بەکارنەهاتووی وڵاتی عوسمانی، بدرێتە ئەو کەسانە کە باشترین و زیاترین سوود بە حکوومەت و خەڵکی ئەو شوێنە دەگەیەنن. لەلایەکی ترەوە، دەبێ بەرنامەو پێڕەوی کانزاکان بەپێی یاسای ئابووری بگۆڕدرێ.

٤٢. پێشخستنی بیمە بۆ کارەسات و ڕووداوەکان و، بەهۆی ئەو یاسایانەوە کە پشتیگری لە کرێکاران و ڕەنجدەران دەکات بەرامبەر بە سەرمایەداران و خاوەنی کاران و، هەوڵدان بۆ دامەزراندنی سندووقی هاوکاریی دوولایەنە.

٤٣. بۆ ئەوەی کەمیی بودجە نەیەتە پێشەوە، پێویستە سەرچاوەی داهات و دارایی لە هەر جۆرە بەکارهێنانێکی خراپ و مامەڵەی ناشایستە دووربێ و، دەبێ بۆ ئەم مەبەستە خەرجییەکانی حکوومەت و داراییی بەشەکانی جێبەجێکردن، بە شێوەیەکی بەردەوام کۆنترۆڵ و چاودێری بکرێن.

٤٤. بەکارهێنانەوەو خستنەوە خزمەتی ئەو کەسە شەرەفمەندو چاکانەی کە لەکاتی ئیدارە نەزانەکەی ئیتیحادو تەرەقیدا، لە کاری بەڕێوەبردن دوورخراونەتەوە. هەروەها ڕێگە خۆشکردن بۆ ئەم جۆرە کەسانە، تا لە وڵاتە ئەورووپییە بێلایەن و دۆستەکاندا خزمەتی حکوومەتی عوسمانی بکەن و بەپێی یاساکانی عوسمانی بجووڵێنەوە.

٤٥. چاککردنی یاساکان بەپێی یاساو ڕێساکانی شەرع و بە شێوەیەك دەبێ کە ئاستەنگ لەبەردەم ئازادیی ڕەفتارو پەیوەندییەکاندا دروست نەکات.

٤٦. سزادانی سەبەبکاری ئەو یاخیبوونانەی کە تائێستا لە وڵاتدا ڕوویان داوە.

# پاشکۆ

## بەرنامەی سیاسیی
## دەستەی ڕیفۆرمی بنچینەیی عوسمانی[٥١]

### پێشەکی

لەوکاتەوەی بوونی سیاسیی خۆمان ڕاگەیاندووە، تەنیا دەنگێکمان لە سەدەکانی ڕابردوو بیستووەو پێگەیشتووە" هەروەها تەنیا بەرەو یەك ئامانجی لەچارەنووسراوو پڕ لە بەختیاری، هەنگاومان هەڵگرتووە، چونکە ئەوکاتانە فرەدەنگیی و هەمەجۆری لەنێو ئامرازەکانی بەزمو ئاهەنگی ئێمەدا لەئارادا نەبوو. لەو ڕێگایەدا کە گرتبوومانە بەر، تەنیا دەستێك سەرۆکایەتیی دەکردین و چرای ڕووناکیی بۆ هەڵدەگرتین. ئەو قۆناغانەش کە دەمانبڕین، تەنیا بە ئەندازەی داوێنپاکیی ئەو دەنگ و دەستە دەیتوانی بگاتە سەرکەوتن.

---

[٥١] ئەم بەڵگەیە کەمێك جیاوازیی لەگەڵ بەو بەرنامەیدا هەیە کە شەریف پاشا لە کۆتاییی کتێبەکەیدا هێناویەتیەوە. بەو جۆرە ئامادە کراوەو کراوەتە پاشکۆ، کە تارق زەفەر تونایا لە زمانی دکتۆر ڕەزا نووریی‌یەوە لێی دەدوێ (ڕێکخراوی شاراوە، دەر سەعادەت، چاپخانەی سەعادەت، ١٣٣٠، ل٤٤٥-٤٤٠)و، کەڵکی لە (پارتە سیاسیەکان لە تورکیا- بڵاوکردنەوەی وەقفی حوڕییەت، ئەستەنبوول، ١٩٨٤، ل٢٢٩-٢٢٦) بۆ وەرگێڕاوە.

مخابن ! كه ئەو دەستە هەڵگری ڕاستی نەبوو و، نەیتوانی و ناشتوانی نوێنەرایەتی ی ڕاستیەكان بكات.

ئێمەش لەگەڵ ئەوەدا، بەرەو نابووتی و لەناوچوونێكی سروشتی ڕۆیشتین. بەداخەوە ! ئەوی دووبارە ئێمەی بۆ لای ڕاستیەكان بانگ كردو دەستووری ڕاستیەكانی پێنیشان دەداین، دیسان هەمان دەنگەو هەر ئەو دەستە بوو، شێوەی گۆڕابوو، بەڵام ناوەڕۆكەكەی وەك خۆی وابوو. ڕزگارمان نەبوو" بێدەنگیەكەمان قووڵتر بوو، ئێستاش لە هێشتایە هەر دەنێژرێین.

هەر لەبەر ئەمە ئەو تەنیا ڕێگەچارەیەی كە عەقڵمان بڕیی، ئەوەبوو كە بەدوای جۆراوجۆری ی دەنگەكان و فرەیی ی دەستەكان و مەعنەویاتدا بگەڕێین و، بایەخێكی كەمتر بە شتی ماددی بدەین.

لە ئەنجامی خوێندنەوەیەكی باشەوە، پەندی باشمان لە خوێناویترین و دڵتەزێنترین ڕووداوو كارەساتەكانی ناو مێژووە ورگرت. هەر لەبەر ئەم ترس و ئەندیشانەو، لە ئەنجامی پەندوەرگرتنەوە لەم دەرسانە، دەستەی (ڕیفۆرمی بنچینەیی)مان بنیات نا.

## خودا سەرمان بخات

بەندی ۱: هەموو بنەما پێكهێنەكانی وڵاتی عوسمانی، بێجیاوازی خاوەنی مافی یەكسان و هاوبەشن. گرووپەكەی ئێمە، دینی ڕەسمی ی حكوومەتی پێكهێنراوی عوسمانی بە دینی ئیسلام لەقەڵەم دەدات. بەڵام لەهەمان كاتدا، ڕێز لە دین و بنەما ڕەوشتی و شتە پیرۆزەكانی لایەنەكانی دەرەوەی ئیسلامیش دەگیرێ و لەبەرچاو دەگیرێن.

بەندی ٢: چەسپاندنی مافە پیرۆزەکانی مەقامی پاشایەتی لە یاساداو، قەدەغەکردنی دەست تێوەردانی ناهەقی هەندێك گرووپ و ڕێکخراوی شاراوە.

بەندی ٣: لەبەر ئەوەی ئەنجومەنەکانی مەبعووسان و ئەعیان بە زەبری چەك هاتوونەتە سەرکار، پێویستە هەڵبوەشێندرێنەوەو، هەڵبژاردنێکی تر بەپێی بنەمای ئازادی ویژدانەکان و دوور لە هەرجۆرە گوشارێك سازبکرێ.

بەندی ٤: سەرلەنوێ نووسینەوەی یاسای بنچینەیی ی (دەستوور)، بەپێی دەستووری وڵاتە پێشکەوتوەکان و بیرو بۆچوون و کولتووری کۆمەڵایەتیمان. هەروەها بەپێی یاساکانی وڵاتە شارستانیەکان، ئازادی ی دەبڕین و بیرو بۆچوون و ئازادی ی کۆبوونەوەو ئازادی ی ڕاگەیاندن لەنێو یاسادا دەچەسپێنرێ.

هەروەها هەڵبژاردن بە جۆرێك دادەنرێ کە ئازادی ی تەواو بداتە هەڵبژێرەکان. لە لایەکی ترەوە، سەربەخۆیی ی تەواوی هێزی یاسادانان و جێبەجێکردن و هێزی داد، دەخرێتە بەر گەرەنتی یاسا.

بەندی ٥: لەبەر ئەوەی ماف و ئەرکەکانی بنەما پێکهێنەکانی وڵاتی عوسمانی، وەك یەکەو یەکسانە، پێویستە ئەرك و شێوازی کاری دەوڵەتیش لەنێو وڵاتی عوسمانیدا، بە شێوەیەکی یەکسان بڵاوبکرێنەوەو، خەڵك ئاگایان لێیان بێ.

بەندی ٦: هیچ لایەنێك بۆی نییە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو یاسایانەدا کە لەلایەن هێزی یاسادانان و پەرلەمانەوە دیاری دەکرێن، باج کۆبکاتەوەو ئەرکی بەو جۆرە بخاتە سەر شانی خەڵك.

بەندی ۷: پێکهێنانی ڕێکخراوی شاراوە، بە هەر ناوێکەوە بێ، قەدەغەیە.

بەندی ۸: هەموو پەیمانە ناونەتەوەییەکان، وەکوو پێشتر، پەسند بکرێن.

بەندی ۹: لەبەر ئەوەی ڕێکخراوی شاراوە، بە قەرزەکانی خۆیەوە، ئەم وڵاتەی بەرەو نابووتی بردووە، پێویستە ئەو هەموو قەرزانە لە ساڵی ۱۹۱۰ بەدواوە حساب بکرێنەوە.

بەندی ۱۰: سەرلەنوێ هەڵسووڕاندنی ئەو کاروبارانەی کە بەپێی ئارەزوو و خواستی کەسەکان کراون. هەروەها لابردنی ئیمتیازی کۆنسوڵخانەی ڕاگەیاندن و پۆستەی کاپیتۆلاسیۆنی دەرەوە. لە لایەکی ترەوە، هەندێك ڕاوێژکاری وڵاتە بێلایەنەکان بۆ کاروباری هەردوو دائیرە وەربگیرێن. بە هەمان شێوە، لە وەزارەتەکانی تریشدا ڕاوێژکاری وڵاتە بێلایەنەکان بەکاربهێنرێن.

بەندی ۱۱: بوونی دادگاکانی سەر بە وەزارەتی داد لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بوونی دادگا عورفیەکان (دادگا تایبەتەکان)[٥٢] و دەست تێوەردانی ئیدارەی سیاسی و ئیدارەی عەسکەری لە کاروبارەکانیاندا، شتێکن لە هیچ وڵاتێکی شارستانی و مەشرووتیدا بەدی ناکرێن. جا لەبەر ئەوەی ئەمانە دەبنە هۆی ڕیسواییەکی زۆر، پێویستە لەڕێگەی یاساوە لابرێن. پێویستە ئەو بڕیارە ناڕەوایانەی کە تائێستا دادگا عورفیەکان داویانە، بەپێی سەربەخۆییەکانی دەستووری بنچینەیی، هەڵبوەشێنرێنەوە، تاوانبارەکان (زیندوو یا مردوو) دووبارە موحاکەمە بکرێنەوە، بەو جۆرەش، ئەو گومانە ڕەش و نەهامەتیەی سەر وڵاتەکەمان پاك بکرێتەوە.

---

[٥٢] دادگای تایبەت کە جاران لەکاتی شەڕو ئاژاوەی ناوخۆ یا شەڕی نێوان دوو دەوڵەتدا پێك دەهێنران و، بە شێوەیەکی گشتی توندوتیژییەکی زۆریان تێدا بوو.

قەدەغەکردنی ئەو ئەشکەنجەو لێدانە دڕندانەیە کە ئەم سەدەی بیستەمو سەردەمی شارستانییە لە تورکیا هەبوون. هەروەها ڕێگرتن لە پەلاماردانو دەستدرێژیکردنە سەر ماڵو شوێنی نیشتەجێبوونو، گوێگرتن لە پەیوەندیەکانی تاکەکان. لەلایەکی ترەوە، پێویستە ئاستەنگی یاسایی لەبەردەم ئەو ئەفسەرانەدا دابنرێ، کە لەخوتو خۆڕایی و بۆ خۆشیی خۆیان مرۆڤ دەستگیرو زیندانی دەکەن.

بەندی ١٢: لابردنی هەموو پلەوپایەی ئیدارەی هەرێمەکانو، گۆڕینی دەستەواژەی (سەدری ئەعزەم) بۆ (سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران).

بەندی ١٣: دابەشکردنەوەی نیشانەکان، بەپێی بەرنامەیەکی تایبەت.

بەندی ١٤: قەدەغەکردنی پێکەوە وەرگرتنی وەزیفەی عەسکەریو سیاسی لەلایەن کەسێکەوە. هەروەها ئەگەر کەسێکی سەرباز بیەوێ ئەرکێکی سیاسی بەجێبهێنێ، پێویستە لەپێشدا پەیوندیەکانی خۆی لەگەڵ سوپادا بپچڕێنێ.

بەندی ١٥: پێویستە سەرباز دەست وەرنەداتە کاروباری سیاسی.

بەندی ١٦: ئێمە دەمانەوێ هێزی ماددیو مەعنەویی وڵاتەکەمانو، ئەوپەڕی سنوورەکانی ئەم وڵاتە، لە مێشکی منداڵەکانماندا جێگیر بکەین. بۆیە پێویستە لەباتی باسی ئەوەی کە چ جۆرە قەڵایەك لەکام سنووردا دروست کراوە، باسی ئەوە بکەین کە چ جۆرە قوتابخانەیەك لەکوێ دروست کراوە.

پێویستە ئەو پارەیەی وا لە بودجەی گشتییەوە بۆ کاروباری عەسکەریو پەروەردەیی خەرج دەکرێ، وەکوو یەك بێ. ئەگەر بودجەی کاروباری عەسکەری چواردە ملیۆن بێو، هی کاروباری پەروەردەش

یەك لە چوارەی ئەو پارەیە بێ، ئەمە مانای وایە وڵات لەنێو زەلکاوی نابووتیدا دەخولێتەوە، چونکە مێژوو ئەوەی سەلماندووە کە ئەگەر نەتەوەیەك بەر لە قەڵەم دەست بۆ چەك بەرێ، بە درۆوە باسی یەکگرتن و تەبایی دەکات. هەر لەم بارەیەشەوە، دەمەوێ نموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە کە زۆر جار ڕووی داوە: دواڕۆژە سەختەکانی ژیانی "ناپلیۆن"، کاتێك ئەڵمانیا یەکەمین سنوورەکانی دیلیبیەکی داماوانەو پڕ لە نەگبەتیی دیاری دەکرد، پیرەمندێك دەیگوت: ((بەر لەوەی سوپاکانمان بەهێزترو، کەلوپەل و ئامێری باشیان بۆ دابین بکەین، پێویستە قوتابخانەکانمان زیاد بکەین. ئەگەر ئەم کارە بکەین، دڵنیابن ئاگاتە نیو سەدە، هەموو نەزانیەکانمان لەناو دەچێ و، ئەمەش دیوارێکی هەتاهەتایی بۆ پاراستنی دەروازەکانی پاریس دروست دەکات)).

خۆی لەڕاستیدا مێژوو ئەم شتەی پشت ڕاست کردەوە. بەڵام شتی پێویست بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە پڕ لە خۆشی و بەختیارییە، تەنیا زیادکردنی قوتابخانەی ئاسایی نییە، بەڵکوو چۆنیەتی و شێوازی وانەگوتنەوەیە. ئەمڕۆ لە وڵاتەکەماندا دەرکەوتووە ئەوەی وا بەنیازی فێربوونی هەمووشتێك دەچێتە ناو قوتابخانە، بەبێ ئەوەی فێری هیچ شتێك بێ، قوتابخانە تەواو دەکات و دەردەچێ.

کەوابوو ئێستا بەر لەوەی قوتابخانە بێکەڵکەکانی ئەم وڵاتە زیاتر بکرێن، پێویستە چاکسازی لە چۆنیەتی و شێوازی وانەکانیاندا بکرێ. هەر لەبەر ئەمە، پێویستە خوێندنی سەرەتایی و بەرزی قوتابخانەکانی ئێمە وردە وردە بەپێی شێوازی پەروەردەی وڵاتە پێشکەوتوەکان گۆڕانی تێدا بکرێ.

بەنــدی ١٧: ئاســایش و ئاســوودەیــیی هــەر وڵاتێــك، لەڕێگــەی زانستیبوونی ئەو وڵاتەو دەسەڵاتی سیاسی و ئیدارەی عەسکەرییەوە، بەرقەرار دەبێ. بەڵام ئەمانەش هەروەکیان لەڕێی ئابوورییەکی باشەوە بەهێز دەبن. بۆیە یەکێك لە کێشە گرنگەکانی ئێمە، هەمان کێشەی چۆنیەتی زیادکردنی سەرچاوەی داهاتە. هەروەها تا ئەو شوێنەی کە بکرێ، پێویستە هەمووشتێك بۆ ئەم مەبەستە بەکاربهێنرێ و، ڕێ بۆ هاتنی سەرمایەی دەرەکی بۆ ناو وڵاتی عوسمانی بکرێتەوە. جێی باسە، سەبارەت بەو شتانەش کە لێرەوە دەنێردرێنە دەرەوە، دەبێ لەپێشدا پێویستیەکانی خەڵکەکەی خۆمان ڕەچاو بکرێ و، دوایی زیادەکە بنێردرێ. هەروەها بۆ ئاگاداری، دەبێ بزانرێت کە ئێمە، بە پێـچەوانەی ئێستاوە، سیاسەتی پشتیوانیکردنی میانڕەوانە بۆ پیشەسازیی ناوەوە پێڕەو دەکەین.

هەروەها پێویستە ڕێ بە کۆمپانیاکانی دەرەوە نەدرێ، کاروباری دەرەکیی بازرگانیەکانمان کۆنترۆڵ بکەن. لەلایەکی ترەوە، بە لەبەرچاوگرتنی داهاتووی کۆمەڵگەکەمان و بۆ ئەوەی چینی کرێکار لە کارگەکاندا نەچەوسێنرێتەوە، بەشێکی کاروباری خۆمان بۆ دانانی هەندێك یاسا تەرخان دەکەین کە مافی کرێکاران بەرامبەر بە سەرمایەداران بپارێزێ و نیشانیان بدات.

بەنــدی ١٨: ئێمە بۆ ئەوەی گەلەکەمان وەك نەتەوەکانی تر بە شادی و ئاسوودەیی بژی، ڕێز لە کاری هەموولایەنێك (بەبێ هاوکاریی حکوومەت) دەگرین.

دامەزراندنی دەزگای هەرەوەزیش، بۆ هاوکاریکردنی خاوەن موڵكو زەوی‌و ڕەنجبەران‌و بازرگانەکان، بەپێی هەل‌ومەرجی گونجاو، دەبێ بە یەکێك لە ئامانجەکانمان. لەلایەکی ترەوە، پێویستە ڕێ لەو گەندەڵیانە بگیرێ کە بە ناوی جووتیارو وەرزێرانەوە دەکرێن‌و، ئەو زەویانەی وا بەکار ناهێنرێن (لەکاتی ئێستادا)، بەپێی یاساو بە زووترین کات لەنێوان هەژارانی نێو جوتیارو وەرزێران‌و کەسانی کۆچەرو خێڵە چادرنشینەکاندا دابەش بکرێن، بە مەرجێك کۆسپ لەبەردەم کاری خاوەن زەوی‌و خاوەن موڵکەکاندا دروست نەکات‌و، پێویستە مەکتەبی تایبەت بە کاروباری کشتوکاڵ‌و گوند، بەپێی توانایی‌و نیازەکانی وڵاتەکەمان، دابنرێ‌و، بە شێوەیەکی سەرەتایی باسی شتە سەرەکیەکانی یاساکانی بازرگانی‌و کشتوکاڵ بکرێ. کتێبەکانی ئەم بابەتانە، دەبێ بە خۆڕایی لەنێو خەڵکی وڵات‌و بە هەموو گۆشەکانی نیشتماندا بڵاوبکرێنەوەو، دەستەیەکیش بۆ ئەم مەبەستە پێك بهێنرێ، بەناو هەموو گوندەکانی وڵاتدا بگەڕێ.

## لەچاپدراوەکانی " بنکەی ژین "

١. ڕەفیق ساڵح، ڕۆژنامەی ژیان: ژمارە (٢٥٩–٣٢٠)، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، ب٣، (٢٣×٣٤سم)، ٢٨٢ل.

٢. عبدالرقیب یوسف، پەیدابوون و دروستکردنی چەکی ئاگردار، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ٧٢ل.

٣. کوردستان لە بەڵگەنامەکانی کونسڵی فەرەنسی لە بەغدا ساڵی ١٩١٩، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ١٧٢ل.

٤. بازیل نیکیتین و کوردناسی، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٤، ٢٧٢ل.

٥. عبدالرقیب یوسف، لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی شێخ مەحمود: تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی ١٩٢٣–١٩٢٤، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، (٢١×٣٣سم)، ٢٠٠٤، ٢٦٦ل.

٦. گ. گرێنڤیل، گ. س. پ. فریمان، ڕۆژژمێرەکانی کۆچی و زایینی، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا، (٢١×١٩سم)، ٢٠٠٤، ١١٥ل.

٧. ڕەفیق ساڵح، ڕۆژنامەی ژیان: ژمارە (٣٢١–٤٠٠)، لێکۆڵینەوەی سدیق ساڵح، ب٤، (٢٣×٣٤سم)، ٢٠٠٥، ٣٥٨ل.

٨. سدیق ساڵح، سەرجەمی بەرهەمی عەبدولعەزیز یاملکی، ب١، (١٤,٨٥ × ٢١سم)، ٢٠٠٥، ١٨٣ل.

